

# ژیانی پێشەوای ئازیزمان ﷺ

## قۆناغی حەوتەم:

### چەند غەزا و چالاکییەکی دوای جەنگی ئەحزاب بە کورتی

### تا وەفاتی سەروەرمان

ئامادەکردنی:

سالارعمر



بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : ژیانی پێشەوای ئازیزمان محمد ﷺ

ئامادەکردنی: سالارعمر

نەخشەسازی ناوەوە: عبدالله خاکی

دیزاینی بەرگ : ڕێدارعومەر



# بەرهەمی: پڕۆژەی ئاگا

## ناونیشانی پڕۆژەی ئاگا لە تۆڕە کۆمەلایەتیەکان



Aga project :: پڕۆژەی ئاگا



@Aga_project



٠٧٥٠٧١٤٧٠٣٧



٠٧٥٠ ٧١٤٧٠٣٧



@aga_kteb



## چەند غەزا و چالاکییەکی دوای جەنگی ئەحزاب بە کورتی

### غەزای بەنو قورەیظە:

دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و سوپاکەی بۆ مەدینە لە جەنگی خەندەق هەر لەو ڕۆژەدا کە گەڕانەوە ڕاستەوخۆ خوای گەورە لە ڕێگەی جوبریلەوە فەرمانی بە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ کرد بۆ دەرچوون بەرەو هۆزی بەنو قورەیظە کە هۆزێکی جوولەکە بوون و بەردەوام خەریکی ئاژاوە گێڕی و هاندانی هۆزەکانی تر بوون لە دژی موسڵمانان.

سوپای موسڵمانان ٣ هەزار چەکدار و ٣٠ ئەسپ سوار بوون.

هۆزی بەنو قورەیظەیان گەمارۆ دا، و ئەوانیش لە کۆتاییە ناچار بوون خۆیان بە دەستەوە بدەن، و چەند کەسێکیان بوونە موسڵمان، و بڕیار درا هەموو پیاوەکانیان بکوژرێ کە ژمارەیان لە نێوان ٦٠٠ تا ٧٠٠ کەس دەبوون، و تەنها یەک ئافرەتیان لێ کوژرا ئەویش لەبەر ئەوە بوو لە سەرەوە شتێکی فڕێدایە سەر حلادی کوڕی سویدەوە و کوشتی، بۆیە بەهۆی ئەوەوە کوژرا.

بەم شێوەیە هۆکارێکی تری درووستبوونی کێشە و ئاژاوە بۆ موسڵمانان کۆتایی هات.

و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ پاش ماوەیەک لە ئافرەتەکانیان لەگەڵ ڕەیحانەی کچی عەمرو هاوسەرگیری کرد.

## کوژرانی سەلامی کوڕی ئەبی الحقیق(ئەبو ڕافع):-

ئەم پیاوە یەکێک بوو لە پیاوە هەرە تاوانبارەکانی جوولەکە و ئەوانەی شەڕی ئەحزابیان دژ بە موسڵمانان هەڵگیرساند و بە هەموو شێوەیە هاوکاریان بوو، و زۆر ئازاری پێغەمبەری خۆشەویستمانی دەدا ﷺ.

پێشتر چەند پیاوێکی هۆزی ئەوس (کەعبی کوڕی ئەشرەف)یان کوشت، هۆزی خەزرەجیش ویستیان ببنە خاوەن شکۆمەندییەکی لەو شێوەیە، بۆیە ڕۆیشتنە خزمەتی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و مۆڵەتی کوشتنی "ئەبو ڕافع"یان لێ وەرگرت بەمەرجێ دەست لە ژن و منداڵیان نەدرێ، و ٥ پیاو لە تیرەی بەنی سەلەمەی خەزرەجی دەرچوون و بەرەو خەیبەر ڕۆیشتن، لەوێ "ئەبو ڕافع"یان لە قەڵاکەی خۆی کوشت و گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ .

## سریەی محمدی کوڕی مسلمە:-

دوای تەواوبوونی جەنگی ئەحزاب و بەنی قورەیظە یەکەم سریە بوون دەرچوون. ژمارەیان ٣٠ ئەسپ سوار بوو، بەرەو قرطاء بەڕێ کەوتن و دایان بەسەر خێڵی بەکری کوڕی کیلاب و ئەوانیش هەڵهاتن و موسڵمانەکانیش مەڕوماڵات و



وشترەکانیان برد و بەرەو مەدینە گەڕانەوە و "ثمامەی کوڕی اثال"یان گرت و لەگەڵ خۆیان بردیان کە گەورەی بەنی حەنیفە بوو، بە نیاز بوو بە فەرمانی موسەیلەمەی درۆزن پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بکوژێت.

کاتێ سریەکە گەڕایەوە "ثمامە"یان بە یەکێک لە پایەکانی مزگەوتەگەوە بەستەوە، و پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو:

چیت دەوێت؟

وتی: چاکەم پێیە، ئەگەر بمکوژی خاوەن خوێنم هەیە، خۆ ئەگەر بەرەڵام بکەیت سوپاسگوزارت دەبم، و ئەگەر ماڵ و سامانت دەوێ داوا بکە، چەندت دەوێت پێت دەدرێت.

پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بەجێیهێشت و دوو جاری تر هاتەوە لای و هەمان گفتوگۆ دووبارە بوویەوە، سێیەم جار دوای تەواوبوونی گفتوگۆکە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ فەرمووی ثمامە بەر بدەن.

ثمامەیان بەردا و ئەویش ڕۆیشتە باخە خورمایەکی نزیک مزگەوتەکە و خۆی شۆرد و پاشان هاتەوە و موسڵمان بوو، و فەرمووی:

وەاللەی لە هەموو دونیا کەسێک نەبوو لە تۆ زیاتر ڕقم لێی بێ، ئێستا ڕوخساری تۆ بەلامەوە لە هەموو دونیا خۆشەویستترە و کۆمەڵێ شتی تری فەرموو.

و فەرمووی کاتێک ئەسپ سوارەکانی تۆ منیان گرت بە نیازی عومرە بووم.

پێغەمبەری خوا ﷺ موژدەی پێیدا و فەرمانی پێی کرد عومرەکەی بکات.

کاتێ گەیشتە مەککە قورەیش پێیان وت:

ثمامە لە ئاینی باپیرانت هەڵگەڕاویتەتەوە؟

وتی: نەخێر وەاللّٰهی لەگەڵ محمد بووم و موسڵمان بووم سوێند بەخوا لە یمامەوە یەک دەنکە گەنم ناگاتە لای ئێوە هەتاکو پێغەمبەر ﷺ فەرمانم پێ نەدات.

کاتێ ثمامە گەڕایەوە شوێنی خۆی ڕێگەی گرت لە ناردنی گەنم بۆ مەککە تا قورەیشی ماندوو و بێتاقەت کرد و ناچار بوون نامە بنێرن بۆ پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و داوایان لێی کرد لەبەر خزمایەتی نامە بنووسێت بۆ ثمامە بۆ ئەوەی ڕێگە بە ڕۆیشتنی گەنم بدات بۆ مەککە، پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ نامەی نارد بۆ ثمامە و ئەویش ڕێگەی دا.

## غەزای بەنو لحیان:-

بەنو لحیان ئەو هۆزە بوون کە ناپاکییان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ و لە ڕەجیع ١٠ هاوەڵەکەیان شەهید کرد.

بۆ تۆڵەکردنەوەیان لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی شەشەمی کۆچی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانی بە ٢٠٠ کەسەوە بۆیان چوونە دەرەوە، و کاتێک گەیشتنە شوێنی ١٠ هاوەڵە شەهید کراوەکە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ نزای لێخۆشبوونی بۆیان کرد، دوای ئەوە بەنو لحیان بەوەیان زانی هەموویان هەڵهاتن بەرەو چیاکان، سوپای موسڵمانان دوو ڕۆژ لەوێ مانەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ



سریەی بە چوارلادا بڵاوکردەوە بەڵام هیچ کەسێکیان دەست نەکەوت، دواتر ڕۆیشتن بۆ عەسفان، و پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ١٠ سواری نارد بۆ (کراع الغمیم) تا قورەیش بەم بابەتە بزانن، پاشان گەڕانەوە مەدینە، لەم غەزەیەدا چواردە شەویان پێچوو، و لە ساڵی ٦ی کۆچیدا ڕوویدا.

## غەزای بەنو المصطلق (مریسیع):-

لە ساڵی ٦ی کۆچی هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ هۆزی بەنو المصطلق هەرچیان پێکراوە کۆیان کردۆتەوە و بەڕێ کەوتوون بۆ شەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی، پێغەمبەری خۆشەویستمان محمد ﷺ بورەیدەی کوڕی حصیبی ئەسلەمی نارد بۆ هەواڵ زانین، ئەویش ڕۆیشت و گەڕایەوە و هەواڵەکەی پشتڕاست کردەوە.

موسڵمانان خۆیان کۆ کردەوە و بەڕێ کەوتن، و حارثی کوڕی ئەبی ضراڕ گەورەی هۆزەکە سیخوڕێکی ناردبوو، بەڵام موسڵمانان پێیان زانی و کوشتیان.

کاتێک هەواڵی هاتنەکەی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و کوشتنی سیخوڕەکە گەیشتەوە بە حارث و هاوڕێکانی هەموویان زۆر ترسان و هەرچی عەرەبی دەشتەکانی لەگەڵ بوو بڵاوەیان لێ کرد، و ئەوەی مایەوە خێرا خۆیان ئامادەکرد بۆ شەڕکردن.

ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە و بە سەرکەوتنی موسڵمانان کۆتایی بە جەنگەکە هات، ئەوەی مایەوە لە ژن و منداڵ و وشتر و مەڕوماڵاتیان کەوتە دەست موسڵمانان، و لە موسڵمانەکانیش تەنها یەک پیاو شەهید بوو، ئەویش پیاوێک لە پشتیوانان بە هەڵە کوشتی وایزانی لە ڕیزی بێباوەڕەکانە.

ئیبن قەیمیش دەفەرمووێ:- ئەوە هەڵەیە و شەڕ و کوشتار ڕوویندەداوە، دای بەسەریاندا لەسەر ئاوەکە و دەستی گرت بەسەر ژن و مناڵ و ماڵ و سامانیاندا، هەروەکو لە صەحیحدا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دای بەسەریاندا و ئەوان ڕایانکرد، ئینجا فەرموودەکەی باس کرد.

یەکێک لە کۆیلەکان جوەیریەی کچی حارث بوو کەوتە پشکی ثابتی کوڕی قەیسەوە و ئەویش بە موکاتەبە ئازادی کرد، پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ پارەی موکاتەبەکەی نارد و هاوسەرگیری لەگەڵ جوەیریە کرد، بەو هاوسەرگیرییە هەموو موسڵمانەکان هەرچی کەسیان لە خزم و کەسوکاری جوەیریە و بەنی مصطلق لەلابوو ئازادیان کرد، کە موسڵمان بوون وتیان:-

تازە ئەوانە بوونە خزمی پێغەمبەر ﷺ.

دوای غەزای بەنو المصطلق چەندین سریە نێردران بۆ کۆمەڵێ هۆز و کۆمەڵە کە دەیانویست هێرش بکەنە سەر موسڵمانان و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ تیرۆر بکەن، بەڵام سوپاس بۆ خوای گەورە هیچیان سەرکەوتوو نەبوون.




هەر لە ساڵی ٦ی کۆچیدا جگەلە ئەوانەی سەرەوە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ چەندین سریەی تری نارد بە هەر چوارلای مەدینەدا.

ئەمانە کۆمەڵێ سریە و غەزا بوون کە لە دوای غەزای ئەحزاب و بەنی قورەیظە ڕوویاندا، و لە هیچ پێکدادانێکدا شەڕی خوێناوی ڕووی نەدا.

## ڕووداوی هەڵبەستنەکە(حادثة الافك)

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ کاتێک دەرچووایە تیروپشکی بۆ هاوسەرەکانی دەکرد، ناوی کێیان دەرچووایە ئەویانی دەبرد لەگەڵ خۆی، لە غەزای بەنی المصطلق ناوی دایکە عائیشە دەرچوو، کاتێک لە غەزاکە گەڕانەوە لە چەند شوێنێک دابەزین، دایکە عائیشە بۆ کارێکی پێویستی خۆی چووە دەرەوە، ملوانکەیەکی خوشکەکەی ون کرد کە لەو سەفەرەدا کە لە ملی کردبوو، گەڕایەوە بۆ ئەوەی بیبینێتەوە، ئەوانەی کە کەژاوەکەیان هەڵگرتبوو چەند کەسێک بوون و لەبەر کەمی کێشی دایکە عائیشە هەستیان بە ئەوە نەکردبوو کە دایکە عائیشەی تێدا نییە، گەر دوو کەس بوونایە هەستیان پێی دەکرد، کاتێک دایکە عائیشە ملوانکەکەی بینییەوە و گەڕایەوە شوێنەکەیان بینی کەسی لێ نەماوەتەوە، لە شوێنی خۆی دانیشت، دەیزانی دوای ئەوەی بزانن هەڵیاننەگرتووە دەگەڕێنەوە بۆ لای، سُبْحَانَ اللّٰه قەدەری خوای گەورە وەها بوو دایکە عائیشە لەبەر ماندوو بوون خەوی لێکەوت.

صفوانی کوڕی معطل لە سوپاکە دواکەوتبوو، چونکە پیاوێکی خەواڵوو بوو.

دایکە عائیشە بە دەنگی صفوان خەبەری بوویەوە کە دەیفەرموو:- ( إِنَّا لِلّٰهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ ) ئەوە ژنەکەی پێغەمبەرە؟

صفوان دایکە عائیشەی ناسییەوە لەبەر ئەوەی پێش دابەزینی ئایەتی حیجاب بینیبووی.



جا دایکە عائیشە سواری وشترەکە بوو و صفوان جڵەوی وشترەکەی گرت و بردیەوە بۆ لای سوپاکە کە لە نحر الظهیرە دابەزیبوون.

هەتا گەیشتنە ئەویٚ دایکە عائیشە جگەلە ڕستەی ( إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ ) هیچی تری لە صفوان نەبیست، چونکە هیچ قسەیەکیان نەکرد.

کاتێک گەیشتنە لای سوپاکە کە خەڵک ئەوەیان بینی هەرکەس بە ویستی خۆی قسەی کرد، و دوژمنی خوای گەورە عبدوڵلای کوڕی ئوبەی دڵ نەخۆش دەستی کرد بە هۆنینەوەی چیرۆکی هەڵبەستراو و بڵاوکردنەوەیان لە نێوان خەڵکی.

کە گەیشتنەوە مەدینە دووڕوان بە هەموو شاری مەدینەدا بوختان و چیرۆکی هەڵبەستراوی زۆر ناشیرینیان سەبارەت بە دایکە عائیشە بڵاو کردەوە، پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بێدەنگبوو و هیچ شتێکی نەوت.

دواتر کە هاتنی وەحی دواکەوت پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد، پێشەوا عەلی فەرمووی:

لێی جیاببەوە و ژنێکی تر بهێنە، ئەمەی بە ئاماژە وت نەک بە ئاشکرا.

ئوسامە و چەند هاوەڵێکی تر فەرموویان: جیا مەبەوە لێی و گوێ بە قسە و باسی دوژمنان مەدە.

دایکە عائیشە کە گەڕایەوە تووشی نەخۆشییەکی سەخت هات و بێئاگا بوو لەو هەموو بوختان و قسە نەشیاوانە، تەنها هەستی بەوە کردبوو کە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ سۆزی بۆی کەم ببووەوە.

کاتێک چاک بوەوە لەگەڵ دایکی مسطح شەوێ چوونە دەرەوە بۆ دەست بەئاو گەیاندن، دایکی مسطح نزای شەڕی لە کوڕەکەی کرد(لەبەر ئەوەی کەسێک بوو لەوانەی کە هەڵبەستنەکەی بڵاو کردەوە)، دایکە عائیشە پێی ناخۆش بوو، جا دایکی مسطح هەواڵەکەی گێڕایەوە بۆ دایکە عائیشە و ئەویش گەڕایەوە لای پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و مۆڵەتی لێی وەرگرت بڕواتەوە ماڵی باوکی و لەوێ بابەتەکەی بۆ ڕوون بێتەوە.

کە گەڕایەوە ماڵی باوکی و بابەتەکەی بۆ ڕوون بوویەوە دەستی کرد بە گریان، دوو شەو و ڕۆژێک فرمێسک لە چاوەکانی وشک نەبوەوە و خەو نەچووە چاوەکانی، پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ ڕۆیشتە لای دایکە عائیشە و کۆمەڵێ قسەی بۆی کرد و دوای ئەوە فرمێسکەکانی کەم بوونەوە، دایکە عائیشە بە دایک و باوکی فەرموو وڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەنەوە، ئەوانیش نەیاندەزانی چی بڵێن، جا دایکە عائیشە فەرمووی: واللەی دەزانم ئەو قسەیە چووە بە گوێتاندا و ئێستا لە دڵتاندا جێگیر بووە و باوەڕتان پێی کردووە، ئەگەر پێتان بڵێم بێگوناهم _خوا دەزانێت بێگوناهم_ ئێوە باوەڕم پێ ناکەن، خۆ ئەگەر دان بنێم بەهەر شتێکدا _خوا دەزانێت بێگوناهم_ ئەو کات باوەڕم پێ دەکەن، وەاللەی هیچ وتەیەکم نییە بە ئێوەی بڵێم جگەلە وتەکەی باوکی یوسف کە فەرمووی (فصبرٌ جميلٌ واللهُ المُستعانُ على ما تصِفون).



پاشان ڕۆیشت و نوست، لەو کاتەدا وەحی هاتە خوارەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی خۆش بوو و پێکەنی، یەکەم وشە لە دەمی پیرۆزی دەرچوو فەرمووی:

خوای گەورە بێگوناهی تۆی ڕاگەیاند.

**(إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ ۚ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ ۚ وَالَّذِي تَوَلَّىٰ كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ...)**[١]

خوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزە و چەند ئایەتێکی تری دوای ئەمەی ناردە خوارەوە.

دواتر ئەوانەی بەشدارییان کرد لە هەڵبەستنی تۆمەتەکە هەر کەسێکیان ٨٠ جەڵدەیان لێدرا، جگەلە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی ڕۆڵی گەورەی هەبوو لەو تۆمەتە ترسناکە، هیچ جەڵدەیەکی لێنەدرا چونکە جەڵتە لێدانەکە دەبووە هۆی کەم کردنەوەی سزای دۆزەخی.

بەم شێوەیە دوای یەک مانگ هەوری گومان و دڵەڕاوکێ و پشێوی لە ئاسمانی شاری مەدینە ڕەوییەوە، و سەرکردەی دووڕووان عەبدووڵڵای کوڕی ئوبەی بەشێوەیەک ئابڕووی چوو دوای ئەوە نەیدەتوانی لە هیچ جێگەیەک سەری بەرز بکاتەوە.

---

[١] سورة النور_١١

## ڕووداوی حودەیبییە تا بەیعەتی ڕضوان بە کورتی

سوڵحی حودەیبییە لەمانگی ذی القعدەی ساڵی ٦ کۆچی ڕوویدا، کاتێک کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد بە شوێنکەوتووەکانی ئامادەکاری بکەن بۆ ڕێوڕەسمەکانی عومرە لە مەککە، دوای ئەوەی لە خەونیدا بینی خۆی و هاوەڵەکانی چوونە مزگەوتی حەرامەوە، عەمرەی ئەنجامداوە عەرەب و خەڵکی دەوروبەری بیابانەکەیان کۆکردەوە بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بچنە دەرەوە .

ڕۆژی دووشەممە سەرەتای مانگی ذي القعدە لە ساڵی ٦ کۆچی دەرچوون بەبێ چەک تەنها چەکی گەشتیاریان هەڵگرتبوو، کاتێک قورەیش بەوەیان زانی بڕیاریاندا نەهێڵن بچنە کەعبەوە، ٢٠٠ سوارچاکیان نارد بۆ ڕێگەی سەرەکی مەککە بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید، بەڵام پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕێگەیەکی سەختتری هەڵبژاردبوو بۆ ئەوەی ڕووبەڕوویان نەبێتەوە، تا گەیشتە حودەیبیە لە دووری ٩ میل لە مەککەوە، کۆمەڵێک کەس هاتنە لای پێغەمبەری خودا ﷺ ئەویش پێیانی فەرموو: ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین، بەڵکو هاتووین عومرە بکەین، شەڕ و کۆشتار قورەیشی ماندوو کردووە، چی دەبێت ئەگەر ئەوان دەستبەرداری نێوان من و سەرجەم عەرەبەکانی تر ببن، ئەگەر ئەوان سەرکەوتن بەسەرمدا ئەوا ئاواتی ئەوان دێتەدی، ئەگەر خودا منیشی سەرخست ئەوا بە لێشاو دێنە ناو ئاینی ئیسلامەوە، با ئەوانیش بە خواستی خۆیان پەیمان لەگەڵ هەر کەس دەبەستن ئازادن، ئیتر قورەیش نیازی چیە؟ سوێند بە خوا بەردەوام تێدەکۆشم لە پێناو ئەو



ئاینەی خودا بە منی ئەسپاردە کردووە، تا خودا سەری دەخات یان من لە پێناویدا لەناو دەچم .

پێغەمبەری خوداش خەراشی کوری ئومەییەی خەراغی ناردە لای قورەیش بۆ ئەوەی پەیامەکەی بگەیەنێتە سەرکردەکانی قورەیش کە بۆ شەڕ نەهاتوون، هەندێک کەس ویستیان نێردراوەکە بکوژن بەڵام حەبەشییەکان ڕێگەیان نەدا بیکوژن و ئازادیان کرد، ئەویش گەڕایەوە لای پێغەمبەری خودا ﷺ . هەڵوێست و نیازەکانی پێغەمبەر بووە جێی سەرنجی هاوپەیمانەکانی قورەیش، قورەیشیەکانیش لە ترسی لە دەستدانی هاوپەیمانەکانی دەستیان کرد بە وتوێژ لەگەڵ پێغەمبەری خودا( ﷺ ). ئەوەبوو کاتێک حولەیسی کوری عەلقەمە گەورەی حەبەشییەکان لەلای موسڵمانەکان گەڕایەوە و بینی ئەوان بەرگی ئیحرامیان پۆشیوە و قوربانیان ئامادەکردووە، وتی ( ئەی سەرکردەکانی قورەیش سوێند بەخوا ئێمە لەسەر ئەوە هاوپەیمانیمان لەگەڵ ئێوە نەبەستووە کە ڕێگە لە کەسانێک بگرن مەبەستیان مەزن ڕاگرتنی ماڵی خودایە، بەو کەسەی گیانی حولەیسی بەدەستە دەبێت واز لە موحەممەد بێنن عومرەکەی بکات، قورەیشیش وتیان بەسە ئەی حولەیس ماوەیەک وازمان لێبێنە تا لەناو خۆماندا لەسەر بڕیارێک ڕێکدەکەوین، پاشان قورەیش بڕیاریاندا لەگەل موسڵمانان وتوویژ بکەن، پێغەمبەری خودا (ﷺ) عوسمانی کوڕی عەفانی وەک نێردراوی خۆی ناردە لای قورەیشییەکان بۆ ئەوەی لەگەڵیان وتوویژ بکات. عوسمان و چەند کەسێکی دیکە بەرەو شاری

مەککە بەڕێکەوتن بۆ ماوەی سێ رۆژ لە مەککە مانەوە. پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ وا گومانی کرد کە کوژرابن بۆیە هاوەڵاکانی بانگ کرد و بەیعەتی لێوەرگرتن کە لە دوژمن ڕانەکەن، هەندێکیشیان بەیعەتی مردنیاندا بە پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەم بەیعەتدانە بە بەیعەتی ڕضوان لە مێژوودا ناسراوە کە لە ژێر دارێکدا ئەنجامدرا و تێیدا ١٤٠٠ کەس یان زیاتر بەیعەتییان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا، و ئەم کەسانە بوونە خاوەن پاداشتێکی تایبەت لەلایەن خوای گەورەوە. کاتێک موسڵمانەکان خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ئەگەری بەرپا بوونی شەڕ قورەیش سوهێلی کوڕی عومەڕیان ناردە لای پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ئەوەی ڕێککەوتنێکی ئاشتەوایی واژوو بکات کە بە سوڵحی حودەیبییە ناسراوە, ئەو ڕایگەیاند هەر ڕێکەوتنێک بکەین پێویستە ئەو بەندەی لەخۆ گرتبێت کە ئەم ساڵ بگەڕێنەوە و ساڵێکی دیکە بێنەوە بۆ ناو مەککە.

لە ئەنجامی ئەم ڕێکەوتنەدا، پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەستا بە ناردنی نوێنەر بۆ لای پاشاکانی جیهان، و بانگی کردنیان بۆ ئیسلام بوون.

**ئەم ڕێککەوتنە (پەیماننامەی حودەیبییە) لە دوو ڕووەوە خەمی بۆ موسڵمانان درووست کرد:-**

یەکەمیان پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بە موسڵمانانی فەرموو:- ئێمە دەڕۆینە بەیت (واتا مەککەی پیرۆز) و طەوافی تێدا دەکەین، ئەی بۆ ئێستا دەگەڕێتەوە و طەوافیش ناکات؟



دووەمیـان: ئەو پێغەمـبەری خـوایە و لەسـەر ڕاسـتییە، و خـوای گەورەش بەڵێنی سەرخسـتنی ئـاینەکەی داوە، ئەی بـۆچی فشـارەکانی قوڕەیشـی قبـوڵ کـرد و موسڵمانەکانیشی ملکەچی خاڵەکانی قوڕەیش کرد؟

ئەم دوو خـاڵە گومـان و دڵەڕاوکێی لە دڵی موسـڵمانان پەیـدا کـرد، و هەسـتی بـاوەڕدارانی برینـدار کـرد، بـۆیە پێشـەوا عـومەڕ ڕۆیشـتە خـزمەت پێغەمـبەری سـەروەرمان ﷺ و کـۆمەڵی قسـەیان کـرد بە یەکەوە و لە کۆتاییـدا پێغەمـبەری سـەروەرمان ﷺ بە عـومەڕی فەرمـوو: دڵنیـابە دێـتەوە (بەیـت) و طەوافیشـی بە دەوردا دەکەیت.

پاشان عومەڕ ڕۆیشتە لای پێشەوا ئەبو بەکر ئەویش هەمان شتی پێ وتەوە.

دواتر خوای گەورە ئایەتی (إنا فَتَحنا لَكَ فَتحاً مُبينا) دابەزاند.

جا پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ ناردی بە شوێن پێشەوا عومەڕدا و ئایەتەکەی بۆی خوێندەوە، دواتر عومەڕ فەرمووی:

پێغەمبەری خوا بە ڕاستی ئەوە فەتحە؟

فەرمووی: بەڵێ.

بەو شێوەی عومەڕ دڵی ئارام بوویەوە و گەڕایەوە.

دوای بەستنی پەیماننامەکە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو:



هەستن قوربانی بکەن، سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە بەڵام هیچ کەسێک هەڵنەستا، پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ ڕۆیشتە ژوورەوە و باسەکەی بۆ ئوم سەلەمە گێڕایەوە و ئەویش پێی فەرموو:

پێغەمبەری خوا گەر ئەمەت پێ خۆشە هەستە بڕۆ دەرەوە و لەگەڵ کەس قسە مەکە تا قوربانییەکەی خۆت سەردەبڕیت، و ئنجا بانگ بکە بۆ ئەوەی سەرت چاک بکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەبێ ئەوەی هیچ شتێ بڵێ بەو شێوەیەی کرد، کە موسڵمانەکان ئەوەیان بینی ئەوانش هەستان قوربانییان کرد و سەریان چاک کرد، بەڵام لە خەم و پەژارەدا لە کاتی سەر چاک کردنی یەکتر خەریک بوو یەکتر خوێناوی بکەن، لەبەر ئەوەی بەهۆی پەیماننامەی حودەیبییە هەستیان بە کەمبوونەوە دەکرد بەرامبەر بێباوەڕان.

دواتر پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ سێ جار نزای خێری بۆ ئەوانە کرد کە سەریان تاشی و یەک جار بۆ ئەوانەی کە کورتیان کردەوە.



## چارەسەربوونی قەیرانی ژێردەستەکان

دوای ئەوەی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە پیاوێکی موسڵمان بەهۆی ئازار و ئەشکەنجەدانی قورەیش لە مەککەوە هەڵهات بۆ مەدینە کە ناوی ئەبو بەصیر بوو.

لەبەر ئەوەی یەکێک لە بەندەکانی پەیماننامەکە ئەوە بوو گەر هەر پیاوێکی موسڵمان لە مەککە هەڵهات و ڕۆیشتە مەدینە دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەرینەگرێت و بیگێڕێتەوە.

بۆیە هاوەڵدانەران دوو پیاویان ناردە لای پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و ئەویش ئەبو بەصیری بۆیان گێڕایەوە.

ئەبو بەصیر و دوو پیاوەکە بەڕێ کەوتن بەرەو مەککە کە لە ڕێگا بوون ئەبو بەصیر بە پیلانێ پیاوێکیانی کوشت و ئەوی تر هەڵهات بەرەو مەدینە و ڕۆیشتە مزگەوتی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و وتی:

هاوڕێکەمی کوشت، منیش دەکوژرێم.

ئینجا ئەبو بەصیر پەیدا بوو و فەرمووی: پێغەمبەری خوا ئیدی خوای گەورە ئێمەی لەسەر ئەستۆی تۆ لابرد، ئەوە ئێمەت گێڕایەوە لایان و خوای گەورە لە دەستیان ڕزگارمی کرد.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ فەرمووی: دایک ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات، ئەم پیاوە گەر کەسێکی تری لەگەڵدا بێت شەڕ هەڵدەگیرسێت.

کە ئەبو بەصیرٍ گوێی لە ئەم قسەیە بوو تێگەیشت کە دەیداتەوە مەککییەکان.

بۆیە لەوێ بەڕێ کەوت تا گەیستە سەیف البحر.

دوای ئەوە ئەبو جندلی کوڕی سوهێل لە دەست هاوەڵدانەران هەڵهات و پەیوەندی کرد بە ئەبو بەصیرەوە، دوای ئەمە هەر کەسێک لە قورەیشییەکان موسڵمان بووایە خۆی دەگەیاندە ئەبو بەصیرٍ، تا گروپێکیان درووست کرد.

ئەم گرووپە هەر کات بیانبیستایە کاروانێکی قورەیش بەرەو شام بەڕێوەیە ڕێگەیان لێیان دەگرت و دەیانکوشتن و ماڵ و سامانەکەیان دەبرد.

بۆیە قورەیش بە ناچاری پیاوی نارده لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵەیە بهێنێتەوە ژێر دەسەلاتی خۆی و دڵنیاییان دا هەر کەسێک پەیوەندی بە مەدینەوە کرد و نەگەڕێتەوە ژیانی سەلامەت دەبێت.

بەو شێوەیە هەموویان گەڕانەوە مەدینە.

## موسڵمانبوونی پاڵەوانەکانی قورەیش

لە سەرەتای ساڵی ٧ی کۆچیدا دوای وەستانی شەڕ عەمروی کوڕی عاص و خالدی کوڕی وەلید و عوثمانی کوڕی طەڵحە موسڵمان بوون.



## قۆناغێکی نوێ:-

١. نامە ناردن بۆ پاشا و میرەکان.

٢. چەند چالاکییەکی سەربازی دوای پەیمانی حودەیبییە بە کورتی.

### ١. نامە ناردن بۆ پاشا و میرەکان:-

لە کۆتایی ساڵی شەشەمدا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە حودەیبییە گەڕایەوە بە نووسراو نامەی نارد بۆ پاشا و میرەکان کە تێیدا بانگیانی دەکرد بۆ ئیسلام، کە ویستی نامە بنێرێ پێیان وت گەر نامەکان مۆری لەسەر نەبێت وەریناگرن.

بۆیە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ مستیلەیەکی زیوی لە دەست کرد و ئەم نەخشەی لەسەر هەڵکەند;

محمد رسول الله، نەخشەکەش سێ دێڕ بوو، محمد دێڕی خوارەوە بوو، رسول دێڕی ناوەڕاست، و الله لە دێڕی سەرەوە بوو.

**ئەو پاشایانەی کە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ نامەی بۆیان نارد:-**

_ نەجاشی پاشای حەبەشە، وڵامی نامەکەی دایەوە و موسڵمان بوو.

_ مقوقس پاشای میصر و ئیسکەندەرییە، بەڕێزەوە وڵامی نامەکەی دایەوە و موسڵمان نەبوو.

_ کیسرا پاشای فارسەکان، موسڵمان نەبوو و نامەکەی دڕاند و سووکایەتی بە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ کرد و بە هەڕەشەوە وڵامی نامەکەی دایەوە، دوای ماوەیەکی کەم بە دەستی کوڕەکەی خۆی کوژرا.

_ قەیسەر (هەرقل) پاشای ڕۆمەکان، بەڕێزەوە وڵامی نامەکەی دایەوە و موسڵمان نەبوو.

_ مونذری کوڕی ساوی فەرمانڕەوای بەحرێن، بەڕێزەوە وڵامی نامەکەی دایەوە و موسڵمان بوو.

_ هوذەی کوڕی عەلی سەرۆکی یەمامە، بەڕێزەوە وڵامی نامەکەی دایەوە، بەڵام بەرامبەر موسڵمانبوونی داوای کۆمەڵێ دەستکەوتی کرد، پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ ڕەتی کردەوە و هیچی پێی نەدا، و فەرمووی کە موڵک و ماڵی هوذە لەناو دەچێت، کاتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەتح تەواو بوون جبریل(سەلامی خوای گەورەی لێ بێ) هەواڵی مردنی هوذەی بە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ گەیاند.

_ حارثی کوڕی ئەبی شەمری غەسانی گەورەی دیمەشق، خۆی بەگەورە زانی و موسڵمان نەبوو.

_ جیفر و عەبدی پاشای عومان (هەردوو کوڕی جلند)، هەردووکیان موسڵمان بوون و ڕێگەشیان دا بەخشین کۆ بکاتەوە و هاوکارییەکی زۆری نێرداوەکەیان کرد دژ بە سەرپێچی کاران.

بەم نامانە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازەکەی خۆی گەیاند بە پاشاکانی جیهان.



## ٢. چەند چالاكییەكی سەربازی دوای پەیمانی حودەیبییە بە كورتی:-

### _غەزای غابە(ذي القرد):-

یەكەم غەزا بوو پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ ئەنجامی دابێت دوای ڕێككەوتننامەی حودەیبییە و پێش جەنگی خەیبەر، كە هەستان بە ڕاونانی پۆلێک لە خێڵی فزارە كە خەریكی چەتەگەریی بوون لەسەرە ڕێگەی پێغەمبەری خوا ﷺ .

### _غەزای خەیبەر(وادي القرى):-

لە ساڵی حەوتەمی كۆچی بەرامبەر بە ساڵی ٦٢٨ی زایینی بە ماوەیەک دوای پەیمانی حودەیبییە لە شاری خەیبەر ڕوویدا.

دوای ئەوەی جوولەكەكانی بەنی نەضیرِ لە مەدینە دوورخرانەوە و چوونە شاری خەیبەر، ئەوان ڕۆڵی زۆریان هەبوو لە هەڵگیرسانی جەنگی خەندەق (ئەحزاب) و لە ڕێگەی هاندانی هۆزە عەرەبییەكان و كۆكردنەوەیان لەگەڵ قورەیشییەكانی مەككە دژی موسڵمانان لەلایەک، لەگەڵ هاندانی جوولەكەكانی بەنی قورەیظە لە مەدینە دژی موسڵمانان لەلایەكی تر، دواتر دروستكردنی پشێوی لەگەڵ هاوكاریكردنی دووڕووەكان لە مەدینە، هەموو ئەمانە لەلایەن جوولەكەكانەوە ئەنجامدرا و هۆكاری پشێوی و جەنگەكان بوون، ئەمە لە كاتێكدا بوو كە پێغەمبەری خودا ﷺ پەیمانی لەگەڵ جوولەكەكان بەستبوو، بەڵام ئەوان

ناپاكییان كرد و دژی موسڵمانان بوون، جوولەكەكانی خەیبەر مەترسیدار بوون بۆ سەر موسڵمانان.

سوپای موسڵمانان بە شەو گەیشتنە سنووری خەیبەر و گەمارۆی قەڵاكانی دەوری شارەكە درا. بەڵام لە سەرەتادا دوای چەند جارێك هەوڵدان نەتوانرا بچنە ناو قەڵاكان و شارەكەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لأعطين هذه الراية غداً رجلاً يفتح الله على يديه يحبُ الله ورسولَهُ و يحبُهُ الله و رسولُهُ) واتا: سبەینێ ئەو ئاڵایە دەدەمە دەستی یەكێك لە ئێوە كە خوا لەسەر دەستی ئەو سەركەوتن بە ئێمە دەبەخشێت، خوا و پێغەمبەرەكەی خۆشدەوێن و خوا و پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت.

ئاڵاكە بەخشرایە عەلی كوڕی ئەبو طاڵیب، ئەویش سەرپەرشتی جەنگەكەی كرد و گەمارۆی سەر قەڵاكانی چڕتر كردەوە.

بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ لەلایەن موسوڵمانانەوە دەوردەدران و دواتر جوولەكەكان داوای خۆبەدەستەوەدان و ئاشتییان كرد، بۆیە جەنگەكە بە سەركەوتنی موسڵمانان كۆتایی هات و دەسەڵاتی قەڵای خەیبەریان كەوتە ژێر دەست.

دوای جەنگەكە موسڵمانان لەگەڵیان ڕێككەوتن لەسەر چەند خاڵێك، بەردەوام بوون لەسەر ئەو ڕێككەوتنە تا لە سەردەمی دەسەڵاتی عومەری كوڕی خەطاب پشێویان دروست كرد و پەیمانیان شكاند بۆیە لە سەردەمی عومەر جوولەكەكان دوورخرانەوە و لە شارەكە بە تەواوی دەركران.



موسڵمانان نزیکەی ٢٠ کەس یان ٢٣ کەسیان شەهید بوو، و جولەکەکانیش ٩٣ کەسیان کوژرا.

و پێش دەست پێکردنی ئەم غەزایە ئەبو هورەیرە گەیشتە مەدینەی پیرۆز و دواتر ڕۆیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بوو.

هەروەها لە دوای فەتح کردنی قەڵای خەیبەر جەعفەر و ئەبو موسای ئەشعەری و هاوەڵەکانی گەڕانەوە لای پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ کە لە کاتی کۆچ کردن بۆ حەبەشە کۆچیان کردبوو بۆ حەبەشە.

دوای تەواو کۆنترۆڵ کردنی تەواوی قەڵای خەیبەر صفیەی کچی حیی یەکێک بوو لەو ئافرەتانەی بە کۆیلە کەوتە ژێر دەست موسڵمانان پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و پێشنیاری کرد صەفیە بۆ خۆی بهێڵێتەوە لەبەر ئەوەی کچی گەورە پیاوێکی بەنی قورەیظە و بەنی نەضیر بوو، پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ ئازادی کرد و هاوسەرگیری لەگەڵ کرد، و ئازاد کردنەکەی کردە مارەیی بۆی.

صفیە هاوسەری کینانەی کوڕی ابی الحقیق بوو بەهۆی ناپاکی کردن و شکاندنی پەیماننامەکەوە لە دوای کۆنترۆڵ کردنی خەیبەر کوژرا.

لە کاتی گەڕانەوە بۆ مەدینەی پیرۆز جولەکەکانی فەدەک و تەیماء بەبێ شەڕکردن خۆیان بەدەستەوەدا و ڕێککەوتنیان لەگەڵ پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ کرد،

بەڵام جولەکەکانی وادی القُری شەڕیان کرد و بە سەرکەوتنی موسڵمانان کۆتایی هات.

جگەلە ئەمانە چەندین غەزا و سریەی تر ڕوویاندا.

## عومرەی قەزا (عمرة القضاء)

عومرەی قەزا ئەو عومرەیە بوو کە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و دوو هەزار لە هاوەڵەکانی بە ئافرەت و منداڵەوە لە ذي القعدەی ٧ی کۆچی ئەنجامیاندا لە بری ئەو عومرەیەی کە بە پێی مەرجەکانی پەیمانی حودەیبیە لە ساڵی پێشوو نەیانکرد. پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ لە ئەم عومرەیە هاوسەرگیری لەگەڵ مەیمونەی کچی حارث کرد، یەکەم عومرە بوو کە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ و موسڵمانان ئەنجامیاندا دوای کۆچکردن بۆ مەدینە، تەواوی ڕووداوەکە سێ ڕۆژی خایاند.

و لە کاتی ڕۆیشتن بۆ عومرە پێغەمبەری خوا ﷺ چەک و کەرەستەی جەنگی لەگەڵ خۆیان برد نەوەک قورەیش پەیمانەکەیان بشکێنن و دەستدرێژی بکەنە سەر موسڵمانان، و کە گەیشتنە یأجج هەموو کەرەستەکانیان لەوێ بەجێهێشت جگەلە شمشێری ئەسپ سوار، و أوسی کوڕی خولی ئەنصاری لەگەڵ دووسەد سواردا بە لای کەرەستەکانەوە بەجێهێشت.



دوای ئەوەی عومرەیان تەواو کرد پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ کۆمەڵێکی تری نارد بۆ لای کەرەستەکانی جەنگ و ئەوانەی لەوێ بوون ڕۆیشتنە مەککە بۆ ئەنجامدانی عومرە.

و ئەم عومرەیە چوار ناوی هەیە؛ (عومرەی قەضاء، عومرەی قەضیە، عومرەی قیصاص، عومرەی صوڵح).

دوای ئەوەی لە ئەم عومرەیە گەڕانەوە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ چەند سریەیەکی بە چواردەوردا نارد.

**_جەنگی موئتە:**

ئەم جەنگە گەورەترین ڕووبەڕووبوونەوەی جەنگی و گەورەترین شەڕی خوێناوی موسڵمانەکان بوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی هەشتەمی کۆچی لە نێوان سوپای پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لەگەڵ سوپای بیزەنتییەکان و غەسانییەکان ڕوویدا لە گوندی موئتە کە دەکەوێتە خوارەوەی شامەوە.

و جەنگی موئتە یەکەمین جەنگی ئیسلامی بوو کە لە دەرەوەی سنووری نیمچە دوورگەی عەرەبی ڕوویدا و یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان سوپای ڕۆمی خاچپەرستان و سوپای موسڵمانان بوو.

هۆكاری ئەم جەنگەش ئەوە بوو كە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ هاوەڵی بەڕێز حارثی كوڕی عومەیرِی وەكو نێردراو نارد بۆ لای گەورەی بەصرە.

لە ڕێگەدا شورحەبیلی كوڕی عەمروی غەسانی كە سەركار بوو بەسەر خەڵكی بەلقائی شامەوە كە لەلایەن قەیصەرەوە دانرابوو، ئەم پیاوە نێردراوەكەی مەدینەی كوشت، ئەم هەڵوێستە هۆكاری سەرەكی هەڵگیرسانی جەنگی موئتە بوو، چونكە لە دابوونەریتی ڕابردوودا هەر نێردراوێك یان پەیامبەرێك یاخود نامەبەرێك پەیامی كەسێكی تری بە كۆمەڵێك بگەیاندایە ڕێگە بە هیچ كەسێك نەدەدرا زیانی پێبگەیەنێت یان بیكوژێت، بۆیە پێچەوانەی ئەو ڕەفتارە ئاماژە بوو بۆ هەڵگیرسانی جەنگ.

بۆیە كاتێك هەواڵەكە گەیشتە مەدینە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ هەموو هاوەڵەكانی كۆكردەوە و بڕیاری جەنگیاندا، لەم جەنگەدا پێغەمبەر ﷺ خودی خۆی بەشداری نەكردووە و لە مەدینە مایەوە، سوپای موسڵمانان ئامادەكرا و ژمارەیان گەیشتە سێ هەزار جەنگاوەر، تا ئەو كاتە ئەمە گەورەترین سوپای ئیسلامی بوو جگەلە سوپاكەی جەنگی ئەحزاب.

بە فرمانی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ هاوەڵ زەیدی كوڕی حاریثە كرا بە ڕابەری سوپاكە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فرمانی كرد كە ئەگەر زەید شەهید كرا هاوەڵ جەعفەری كوڕی ئەبو طاڵیب ببێت بە جێگرەوەی، ئەگەر ئەویش شەهید كرا عەبدوڵڵای كوڕی ڕەواحە بكرێت بە جێگرەوەی، هەروەها ئەگەر ئەویش شەهید



کرا پێویستە موسڵمانان لەنێو خۆیان ڕاوێژ بکەن و هاوەڵێک لەناو خۆیان بکەن بە ڕابەر و سەرکردەی سوپا.

سوپای موسڵمانان بەرەو وڵاتی شام کەوتنەڕێ، گەیشتنە ناوچەی مەعان لە خاکی شام، لەو کاتەیە زانیان ڕووبەڕووی سوپایەک دەبنەوە کە ژمارەیان دوو سەد هەزار کەسە، کە سەد هەزاریان سوپای هەرقل بوو و سەد هەزارەکەی تریش هی پێنج خێڵی ناوچەکە بوون.

ژمارەی سوپای بێباوەڕان لە سوپای موسڵمانان زۆر زیاتر بوون، بۆیە سوپای موسڵمانان دوو ڕۆژ لە نزیک ناوچەی مەعان مانەوە و ڕاوێژیان لەنێوان یەکتر کرد کە ئایا بگەڕێنەوە بۆ مەدینە یان هێرش بکەن، دواجار لەسەر ئەوە کۆک بوون کە ڕووبەڕووی سوپای بەرامبەر ببنەوە و نەگەڕێنەوە مەدینە.

دواجار لە گوندی موئتە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی زۆر سەخت لە نێوان هەردوو سوپاکە ڕوویدا، سەرکردەی موسڵمانان لە سەرەتای جەنگەکە زەیدی کوڕی حاریثە بوو پاشان شەهید کرا، ڕابەرایەتی سوپا درا بە جەعفەری کوڕی ئەبو طاڵیب دوای ئەویش کە شەهید کرا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کرا بە پێشەنگ تاکو ئەویش شەهید کرا.

دوای شەهیدکردنی هەرسێ سەرکردە دیاریکراوەکە موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا هاوەڵ خالیدی کوڕی وەلیدیان کردە سەرکردەی سوپای موسڵمانان.

خالیدی کوڕی وەلید پلانی پاشەکشێی داڕشت، چونکە دەیزانی کە سوپاکەی چیتر توانای بەرگەگرتن و ڕووبەڕووبوونەوەی نەماوە، بڕیاری پاشەکشەیدا، بەڵام بە مەرجێک کە سوپای ڕۆمەکان لە کاتی پاشەکشەی سوپای موسڵمانان دوایان نەکەون، بۆیە بۆ ئەم مەبەستە پیلانێکی زۆر ژیرانەی داڕشت و گەڕانەوە مەدینەی پیرۆز بەبێ ئەوەی سوپای دوژمن شوێنیان بکەون.

لە ئەنجامی ئەم جەنگەدا ١٢ هاوەڵ لە سوپای موسڵمانان شەهید کران و ژمارەی کوژراوانی سوپای دوژمن نادیارە، بەڵام باسی درێژەی شەڕەکە بەڵگەیە لەسەر زۆری کوژراوەکانیان.

جەنگی موئتە بە پاشەکشەی موسڵمانان کۆتایی پێهات، بەڵام پێگەی موسڵمانان و ئیسلامی لە نێو هۆزە عەرەبییەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی زیاتر بەهێز کرد و ئەو خێڵانەی کە بەردەوام هەڵدەگژان بە ڕووی موسڵمانان وەکو (بەنو سولەیم و ئەشجەع و غەطەفان و ذبیان و فرازە) و چەندانی تر هەموویان موسڵمان بوون.

هاوکات ئەم جەنگە بووە دەستپێکی زنجیرە جەنگێک لەگەڵ ڕۆمی بیزەنتییەکان و موسڵمانان.

دوای ئەم جەنگە هەواڵ بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت کە چەند هۆزێک لە دەوروبەری شام کۆمەک و هاوکاری دەنێرن بۆ ڕۆمەکان لە دژی موسڵمانەکان، بۆیە چەند سریەیەکی نارد بۆ سەر ئەو هۆزانە بۆ ئەوەی ئەوانیش چیتر بوێری ئەوە نەکەن دژی موسڵمانان بجەنگن یان بەسەریاندا بدەن.



## _(فَتْحُ مَكَّة)= ڕزگارکردنی (مَكَّة)ی پیرۆز:

لە نۆزدەی ڕەمەزان، ساڵی هەشتەمی کۆچی، شاری(مَكَّة)ی پیرۆز ڕزگار کرا.

هۆیەکەی: لە پێکهاتنەکەی (الْحُدَيْبِيَة)، پێغەمبەر ﷺ و کافرەکانی (قُرَيْش) وەها پێک هاتبوون (هەر کەسێک پێی خۆش بێ با ببێتە هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ، هەرکەسێکیش پێی خۆش بێ با ببێتە هاوپەیمانی (قُرَيْش).

جا هۆزی(خُزاعَة) بوونە هاوپەیمانی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە لە کۆنەوە هۆزی (خُزاعَة) هاوپەیمانی (عَبْدُ الْمُطَّلب)ی باپیری پێغەمبەر ﷺ بوون، هۆزی (بَنِي بَكّر)ش بوونە هاوپەیمانی (قُرَيْش).

جا ئەم دوو هۆزەش پێشتر دوژمنایەتیەکی کۆنیان لە نێواندا هەبوو، ئینجا لە دوای پێکهاتنەکەی (الحُدَيْبِيَة)، ڕۆژێک پیاوێکی (بَنِي بَكّر) جنێوی دا بە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ، پیاوێکی (خُزاعَة)ش گوێی لە جنێوەکە بوو و هەڵسا لە جنێودەرەکەی دا و سەری بریندارکرد، جا (بَنُو بَكّر) داوای یارمەتیان لە (قُرَيْش)کرد، کافرەکانی (قُرَيْش)ش چەک و چەکداریان بۆ یارمەتی (بَنِي بَكّر) ناردن و لە شەوێکدا بە نهێنی لە لای ئاوەکەی (الوَتِير) هێرشیان کردە سەر (بَنِي خُزاعَة)و بیست پیاویان لێکوشتن، (خُزاعَة)ش هیچ ئاگایان لەم هێرشە نەبوو.

جا (عَمْرو بن سالِم الخُزاعي)ی گەورەی هۆزی (خُزاعَة) لەگەڵ چل کەسی هۆزەکەی بۆ سکاڵا هاتنە (مَدينَة)، جا (عَمْرو) لە مزگەوت هاتە خزمەت پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ و بە پێوە ڕاوەستا و ئەم شیعرەی گوت:

یارَبّ إنّي ناشِدٌ مُحَمَّدا

حِلفَ أَبِينا وَأَبيهِ الأَتلَدا

أنَّ قُرَيشاً أَخلَفوكَ المَوعِدا

وَنَقَضُوا مِيثاقَكَ المُؤكَدا

هُمْ بَيَّتُوناً بِالوَتير هُجَّدا

وَقَتَلُونا رُكَّعاً وَسُجَّدا

فانضُرْ هَداكَ اللَّهُ نَصراً أَعتَدا

وَادعُ عِبادَاللَّهِ يأتوا مَدَدا

خودایە من لە محمد ﷺ دەپاڕێمەوە بەو هاوپەیمانیەی لە کۆنەوە لە نێوان باوکی ئێمە و باوکی ئەودا هەیە، ئەی پێغەمبەر ﷺ، (قُرَيْش) وەعدەکەیان نەگەیاندە جێ و پەیمانەکەی تۆیان هەڵوەشاندەوە، ئەوان شەوێ لەناکاو لەلای (الوَتير) هێرشیان کردینە سەر لەو کاتەی ئێمە خەوتبووین، هەم لە ڕوکوع و سوجدەدا ئێمەیان کوشت، کەوابوو: بە یارمەتیدانێکی ئامادەکراو یارمەتیمان بدە-خودا ڕێنموونیت بکا- داوا لە بەندەکانی خوا بکە بێنە یارمەتیمان.

جا پێغەمبەری خوا ﷺ فرمێسکی لە چاوەکان هاتنە خوارەوە و فەرمووی: یارمەتیت دەدرێ، ئەی (عَمرو بن سالِم)، یارمەتیم نەدرێ ئەگەر یارمەتی (بَني كَعّب)=(خُزاعَة) نەدەم.



جا لەو کاتیشدا پارچە هەورێک بە ئاسماندا هات و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمووی: ئەم هەورە سەرکەوتنی (بَني كَعّب)=(خُزاعَة)ی لێدەبارێ.

جا پێغەمبەر ﷺ بە وەفدەکەی (خُزاعَة)ی فەرموو: ئێوە بگەڕێنەوە و لە ڕێگەشدا پەرت ببن، واتە: تاکوو خەڵک نەزانێ هاتوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ.

لەلایەکی تریش: کافرەکانی (قُرَیْش) لەم پەیمانشکاندنە زۆر پەشیمان بونەوە و داوایان لە (أبُو سُفیان) کرد بچێتە لای پێغەمبەر ﷺ، تاکوو پێکهاتنی جەنگ وەستاندنەکە نوێ بکاتەوە و ماوەکەشی زیاتر بکا، نەشیاندەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەی زانیووە.

جا (أبُو سُفیان) بەپەلە هاتە (مَدينَة)و ڕاستەوخۆ چووەماڵی (أُم حَبيِبة)ی کیژی خۆی (ﷺ) کە ژنی پێغەمبەر ﷺ بوو، جا (أبُو سُفیان) ویستی لەسەر یاتاغی پێغەمبەر ﷺ دابنیشێ، بەڵام (أُم حَبيِبة) (ﷺ) یاتاغەکەی پێچایەوە و ڕێگای نەدایێ لەسەری دابنیشێ، جا (أبُو سُفیان) وتی: کیژم نازانم یاتاغەکەت پێ شیاوی من نەبوو، یان منت پێ شیاوی یاتاغەکە نەبوو؟

(أُم حَبيِبة)ش (ﷺ) فەرمووی: ئەمە یاتاغی پێغەمبەرە ﷺ تۆش کافری و پیسی، بۆیە پێم خۆش نەبوو لەسەر یاتاغەکە دابیشی.

جا (أبُو سُفیان) گوتی: کیژم وادیارە لە دوای من خراپەت توش بووە؟

(أُم حَبيِبة)ش (ﷺ) فەرمووی: بەڵکو خوای گەورە هیدایەتی داوم و بوومە مسوڵمان، تۆش بەردێکی وەها دەپەرستی کە نابیستێ و نابینێ.

جا (أبُو سُفيان) هاتە خزمەت پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و گوتی: ئەی محمد ﷺ هاتوومە پێکهاتنەکەی (الحُدَيبِيَة) پتەوتر بکەین و ماوەکەشی زیاد بکەین؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: شتێک لەلایەن ئێوە ڕووی داوە؟ (أبُو سُفيان) گووتی: نا ئێمە هەر لەسەر پێکهاتنەکەی خۆمانین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئێمەش هەر لەسەر پێکهاتنەکەی خۆمانین، جا هەرچەند (أبُو سُفيان) داوایەکەی دووبارە کردەوە، پێغەمبەر ﷺ هیچی تر وەڵامی نەداوە.

جا (أبُو سُفيان) چووە لای پێشەوا (أَبُو بَكّر) (رضي الله عنهُ)، بەڵام پێشەوا (أَبُو بَكّر)ش (رضي الله عنهُ) فەرمووی: پاراستنی من لە پاراستنی پێغەمبەردایە ﷺ، واللّٰهِ ئەگەر جەنگتان لەگەڵ بکا، من لە دژی ئێوە یارمەتی دەدەم.

جا ئەمجارە (أبُو سُفيان) چووە لای ئیمامی (عُمَر) (رضي الله عنهُ)، هیچی بۆنەکرد.

پاشان چووە لای ئیمامی (عُثمان) (رضي الله عنهُ)، ئەویش هیچی بۆ نەکرد، ناچار چوە ماڵی ئیمام (عَلي) (رضي الله عنهُ)، ئیمام (عَلي)ش (رضي الله عنهُ) فەرمووی: ناتوانین لەم بارەیە قسە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بکەین، جا (أبُو سُفيان) گووتی: ئەی (فاطِمة) تۆ شتێکمان بۆ بکە. (فاطِمة) (ﷺ) فەرمووی: من ئافرەتم. جا (أبُو سُفيان) گووتی: بە کوڕەکانت (حَسَن)و (حُسَّين) بڵێ: ئەوان شتێک بکەن. حەزرەتی (فاطِمة)ش (ﷺ) فەرمووی: ئەوان منداڵن، منداڵی ئەوها ئەم کارە ناکا.



ئیتر (أبُو سُفیان) دەچووە لای هەموو گەورە پیاوان، هەموویان وەڵامیان دەدایەوە و دەیان فەرموو: بڕیاری ئێمە لەگەڵ بڕیاری پێغەمبەردایە ﷺ. جا بۆ ئەوەی وازیان لێبێنێ، ئیمام (عَلي) (رضي الله عنهُ) پێی فەرموو: بەخۆت بڕیاری پاراستنی خەڵك بدە.

جا (أبُو سُفیان) چووە مزگەوت و بەدەنگی بەرز گووتی: هۆ خەڵکینە، من خەڵکم لە یەکتری پاراستوە، واتە: هیچ کەسێک جەنگ لەگەڵ کەسی تر نەکا.

جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ خۆت ئەو قسەیە دەکەی.

جا (أبُوسُفْیان) گەڕاوە و ئەنجامی سەفەرەکەی بۆ کافرەکانی (قُرَیْش) گێڕاوە. جا (قُرَیْش) گوتیان: هیچت بە هیچ نەکردووە و (عَلِي)ش بەم ڕێنموونی کردنە گاڵتەی پێ کردووی. جا لە دوای گەڕانەوەی (أبُوسُفْیان) پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرمانی دا خەڵکەکە خۆیان بۆ غەزا ئامادە بکەن، بەڵام شوێنی غەزایەکەی ئاشکرا نەکرد. جا ئیمام (أبُوبَکرْ) (رضِي اللّهُ عَنهُ) چووە ماڵی دایکە (عائِشَة)ی کیژی خۆی (رَضِي اللّهُ عَنها) بینی پێویستیەکانی سەفەر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە دەکات، بەڵام نەیدرکاند پێغەمبەر ﷺ مەبەستی کوێیە. ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە ئیمام (أَبُوبَکرْ) و ئیمام (عُمَر) (رَضِي اللّهُ عَنهم) کرد و فەرمووی: ئەوانە پەیمانی پێکهاتنەکەیان شکاندووە؟جا ئیمام (أَبُوبَکرْ ) (رَضِي اللّهُ عَنهُ) وای پێ خۆش بوو ئەم جارە لێیان ببورێ، بەڵام ئیمام (عُمَر) (رَضِي اللّهُ عَنهُ) هانی داو فەرمووی: ئەوانە سەری کوفرن. ئەوان دەیانگوت: تۆ ساحیری و درۆزنی، وَاللَّهِ

عەرەبەکان زەلیل نابن و سەرشۆر ناکەن تا دانیشتوانی (مَكَّة) سەرشۆڕ دەکەن.
جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە پێناوی خوادا (عُمَر) لە بەرد ڕەقترە. ئینجا پێغەمبەر ﷺ بڕیارەکەی ئیمام (عُمَر)ی (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) هەڵبژارد و فەرمانیشی دا ئەم کارە ئاشکرا نەکرێ و هەم لەسەر هەموو ڕێگەکانیش چاودێری دانان، تاکو هەر کەسێکی نەیناسن بیگەڕێننەوە، بۆ خۆشی نزای کرد و فەرمووی: (اللهُمَّ خُذْ عَلَى أسماعِهِمْ وَأَبصارِهِمْ فَلا يَرَوْنا إلاَ بَغْتَةً) خودایە گوێ و چاوەکانی کافرەکانی (قُرَيْش) بگری، تاکو نەمان بینن تەنها لەناکاودا نەبێ. واتە: تاکو نەتوانن خۆیان بۆ جەنگ ئامادە بکەن.

لە ڕۆژی (فَتْح مَكَّة)دا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هَذَا مَا وَعَدَنِي رَبِّي. ثُمَّ قَرَأَ إذا جَاءَ نَصْرُ اللهِ...) [رواه الطبراني في الأوسط]، ئەمە ئەو سەرکەوتنەیە کە خوا بەڵێنی پێدابووم. ئینجا سورەتی (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ...)ی خوێندەوە، کە خوای گەورە دەفەرمووێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ، إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ) ئەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەرکەوتن و یارمەتی خوا بۆ تۆ هات لەسەر دوژمنەکانت (وَالْفَتْحُ) کاتێ (مَكَّة)ش ڕزگار کرا (وَرَأَيْتَ النَّاسَ) وە لەدوای ڕزگارکردنی (مَكَّة)ش ئەو خەڵکەت دیت (يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا) کۆمەڵ کۆمەڵ دێنە ناو ئاینی ئیسلام، ئەوکاتە (فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ) بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ)، واتە: شوکر و سوپاسی خوا بکە لە بەرامبەر ئەو سەرکەوتن و ڕزگارکردنەی (مَكَّة)، (وَاسْتَغْفِرْهُ) و بڵێ: (أَسْتَغْفِرُ



الله) واتە: داوای لێ خۆشبوون لە خوا بکە (إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا) چونکە خوای گەورە زۆر تەوبە قبوڵ دەکات و لە گوناهەکان خۆش دەبێت.

(ابن عباس) (رضي الله عنه) فەرموویەتی: ئەم سورەتە (إِذَا جاءَ) دوایین سورەتی قورئانە کە هەمووی بەیەکەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە خوارەوە. هەم فەرموویەتی: ئەم سورەتە (إذا جاء) ئاشکراکردنی وەفاتکردنی پێغەمبەرە ﷺ، واتە: زمانحاڵی سورەتەکە دەفەرمووێ: (ئەی پێغەمبەر ﷺ کە خوای گەورە سەرکەوتنی دایێ و (مَكَّة) لە ژێر دەستی کافرەکانی (قُرَيش) ڕزگار کرا، ئەوکاتە عەرەبەکانی تریش سەرشۆڕ دەکەن و کۆمەڵ کۆمەڵ دێنە ناو ئاینی ئیسلام، لە ئەنجامدا موسڵمانەکان دەبنە گەورەترین هێزی دوورگەی عەرەب و هیچ کەسێک ناتوانێ بەرهەڵستیان بکات، بەڵکو هێزی ئیسلام دەگاتە ئەو پلەیەش: دەتوانی ڕووبەڕووی زلهێزەکانی دەوروبەری ببێتەوە و خەڵکی لە ژێر ستەمی ئەوان ڕزگار بکات، جا ئەوکاتە- ئەی پێغەمبەر ﷺ- کاری تۆ لە دونیادا تەواو دەبێ و خۆت ئامادە بکە بۆ وەفاتکردن و چوونە لای خوا، کەوابوو: لەسەر ئەو نیعمەتە گەورەیە زۆر تەسبیحات و شوکری خوا بکە و داوای لێخۆشبوونیش لە خوا بکە بۆ خۆت و ئوممەتت).

پرسیار: ئەوە زانیمان ئەو سەرکەوتن و ڕزگارکردنەکەی (مَكَّة) بە یارمەتیدانی خوای گەورە بوو، بەڵام (إذا أرادَ اللهُ شَيْئاً هَيَّأَ أَسْبابَهُ) ئەگەر خودا ویستی کارێك بکا، هۆکارەکانیشی بۆ ئامادە دەکات. ئایا هۆکاری ئەم سەرکەوتنە چی بوو؟ وەڵام:



پـێش هەمـوو شـتێک لێزانـی و کـارلەجێیی پێغەمـبەری خـوا ﷺ بـوو، بە تەواوی پێکهـاتنەکەی (الحُدَیْبِیَـة) بێـنەوە بیـر خـۆت: لە لایەک: (صَـحابَة)کان (رضـي الله عنهم) نـاڕازی بـوون و بەدڵی شـکاو گەڕانەوە؟ چـونکە ئەنجامەکەیـان نەدەزانی، لە لایەکی تـریش: پێغەمـبەر ﷺ گـوێی نەدا بە نـاڕەزایی ئەوان، بەڵکـو بە ڕەزامەنـدی خـوای گەورە پێکهـاتنەکەی واژوو کـرد و خـوای گەورەش نـاوی لەو پێکهـاتنە نـا: (فَتْحـاً مُبِینـاً) سـەرکەوتنێکی ڕوون و ئاشـکرا، چـونکە ئەنجـامەکەی ڕزگـارکردنی (مَکَّة) بوو.

جـا لەدوای لێـزانین و کـارلەجێی پێغەمـبەریش ﷺ تێکۆشـان و قوربانیـدانی (صحابة)کان (رضي الله عنهم) بوو، (أحد أحد)ی هاوەڵ (بلال الحبشي) (رضي الله عنه) بوو، کۆچکردن و بەجێ هێشـتنی ماڵ و وڵات بـوو، ئەو (صحابة) بە غیرەت و ڕێـزدارانەی لە سـەربازگەی پێغەمـبەردا ﷺ مەشـقی قوربانیـدان و گیانفیـداییان کردبـوو، ئەو (صحابة) خـاوەن هەڵوێسـتانەی لە پێنـاوی خـوادا خـزم و کەسـیان فـڕێدان و ڕازی نەبوون لە ژێر ستەمی کوفردا بژیێن، ئەوان بـوون (مَکَّة)یان ڕزگار کـرد و لەدوای هەشـت سـاڵان بە سـەربەرزی هـاتنەوە سـەر موڵـک و مـاڵی خۆیـان (رضي الله عنهم)، و دڕندەترین دوژمن سەری بۆ شـۆڕ کردن.



## غەزای (حُنَیْن) = (هَوازِن) = (أَوْطاس):

(حُنَیْن) دۆڵێکە لە نێوان (مَكَّة) و (طائِف) لە تەنیشت (ذِي الْمَجاز) هەروەها (أَوْطاس) و (هَوازِن)ش لەوێوە نزیکن.

ئینجا کە لە دوای (فَتْح مَكَّة) دەوڵەتی بتپەرستی هەرەسی هێنا و (قُرَیْش) و هۆزەکانی تریش کۆمەڵ کۆمەڵ موسوڵمان دەبوون، گەورە پیاوەکانی هۆزی (هَوازِن) و هۆزی (ثَقِيف) چوونە لای یەکتری و ڕق و قینەی خۆیان دەرخست بەرامبەر ئەو سەرکەوتنە گەورەی ئیسلام، بە یەکتریان گوت: (مُحَمَّد) ﷺ بەسەر خزم و کەسەکانی خۆیدا سەرکەوت و هیچ ڕێگرێکی نییە هێرش بکاتە سەر ئێمە، کەوابوو پێش ئەوەی ئەو هێرشە بێنێ، با ئێمە هێرش بکەینە سەر ئەوی.

ئینجا هەردوو هۆزەکان لەشکرێکی زۆریان کۆکردەوە و (مالِك بن عَوْف) ی سەرۆک هۆزی (هَوازِن) بووە سەرکردەی هەموو لەشکرەکە، کە ژمارەی لە بیست هەزار زیاتر بوو، جا چەند هۆزێکی تری عەرەبەکانیشیان لەگەڵ بوون، یەکێک لەو هۆزانە (بَنِي سَعْد بَنِي بَكْر) بوون کە هۆزەکەی (حَلِيمَة السَعَدِيَّة)ی دایکە شیریەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو، جا (مالِك) فەرمانی بە خەڵکەکە کرد ماڵ و ژن و منداڵەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا بهێننە جەنگ، تاکوو مەیدانی جەنگ بەجێ نەهێڵن و بەرگری لە ماڵ و خێزانیان بکەن.

بەڵام (دُرَيْد بن الصِّمَّة) - کە پیاوێکی لێزانی تەمەن سەد و بیست ساڵی بوو- ڕەخنەی لەم کارەی (مالِك) کرد و گوتی: ئایا هیچ شتێک پیاوی هەڵاتوو

دەگەڕێنێتەوە؟ جا (دُرَیْد) گوتی: ئەم ماڵ و منداڵە بگەڕێنەوە. بەڵام (مالِك) گوێی نەدایێ و لەشکرەکەی بە ماڵ و منداڵەوە لە (أَوْطاس) لە نێوان (مَكَّة) و (طائِف) دابەزاند. ئینجا کە پێغەمبەر ﷺ ئەم هەواڵەی گەیشتێ (صَحابَة)یەکی خۆی نارد کە ناوی (عبدللە بن أبي حَدْرَد الأسلَمِي) بوو -رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ- فەرمانی پێکرد بچێتە ناو ئەو هۆزانە و هەواڵی لەشکرەکەیان بۆ بهێنێ. جا (عبدللە) رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ- چووە ناو هۆزەکان و دوو ڕۆژان لە ناویاندا مایەوە، ئینجا گەڕاوە و هەواڵەکەیانی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێناوە. جا کە پێغەمبەر ﷺ ویستی بۆ غەزایەکە بڕوات پێیان گوت: (صَفْوان بن أُمَيَّة) -کە هێشتا مسوڵمان نەبوبو- چەند زرێ و چەکی لایە، جا پێغەمبەر ﷺ ناردیە لای، تاکوو ئەو چەک و زرێیانەیان بۆ بنێرێ، جا (صَفْوان) گوتی: ئەی (مُحَمّد) ﷺ بە داگیرکردن لێم وەردەگری؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (( بَلْ عارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ حَتَّى نُؤَدِّيَهَا إلَيْكَ )) بەڵکو بە خواستنێکی گەرەنتیکراو لێت وەردەگرم تا دەیاندەینەوە بە تۆ، واتە: ئەگەر فەوتان، تۆڵەیان دەژمێرین. جا (صَفْوان) سەد زرێی بە تەواوی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ. ئینجا پێغەمبەر ﷺ لە شەشی مانگی (شَوّال)ی ساڵی هەشتەمی کۆچی لە (مَكَّة) دەرچوو، دوانزە هەزار چەکداری لەگەڵدا بوو: دە هەزار (صَحابَة) ی (مَدِينَة)- کە لە (فَتْح مَكَّة) بەشدار بوون- دووهەزاریش خەڵکی (مَكَّة)، کە تازە مسوڵمان بووبوون. هەر لە خەڵکی (مَكَّة)ش، هەشتا چەکداری کافر و چەند ئافرەتێکیش لەگەڵ لەشکرەکەدا ڕۆشتن بۆ تاڵانگرتن.



جا (صَحابَة)کان بە سەرسووڕمانەوە تەماشای ئەم لەشکرە زۆرەیان دەکرد و یەکێکیان بە شانازیەوە گوتی: ئەمڕۆ لەبەر کەمی ئێمە نابەزێندرێین. بەڵام پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ئەم قسەی پێ ناخۆش بوو.

جا لەشکری ئیسلام لە دەی مانگی (شَوّال) گەیشتە (حُنَیْن) ئینجا کە (مالِك بن عَوْف) زانی پێغەمبەر ﷺ بۆ جەنگ هاتووە، یەکسەر لەشکرەکەی خۆی هێنا بۆ(حُنَیْن) و لە ناو تەنگایی و گەڵیەکانی دۆڵی (حُنَیْن)دا خۆیان حەشاردا و (کَمِین)= بۆسەیان بۆ (صَحابَة)کان رَضِيَ اللهُ عَنْهم داناوە، ئینجا لە تاری و ڕۆنی بەیاندا (صَحابَة)کان رَضِيَ اللهُ عَنْهم گەیشتنە دۆڵی (حُنَیْن) و کافرەکان بە تێکڕایی تیربارانیان کردن جا (صَحابَة)کان رَضِيَ اللهُ عَنْهم خۆیان پێنەگیرا و پاشەکشەیان کرد و مەیدانیان بەجێ هێشت بەڵام پێغەمبەر ﷺ هەڵنەهات و خۆی گەیاندە لای ڕاستە و بانگی (صَحابَة)کانی دەکرد دەیفەرموو: وەرنە لای من.

هەروەها دە (صَحابَة)ش لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ مانەوە وەک ئیمام (أَبُو بَکْر) ئیمام (عُمَر) ئیمام (عَلِي) ئیمام (الْعَبّاس) ی مامی پێغەمبەر ﷺ و لەگەڵ (الْفَضْل)ی کوڕی و (أَبُو سُفْیان بن الْحارِث)ی کوڕە مامی پێغەمبەر ﷺ و هەندێکی تر رَضِيَ اللهُ عَنْهم، جا پێغەمبەر ﷺ بە سواری هێسترە سپیەکەی خۆی بەرەو کافرەکان غاری دەدا و دەیفەرموو: (( أَنَا النَّبِيّ لا كَذِبْ، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ )) من پێغەمبەرم هیچ درۆ نییە، من کوڕی (عَبْدِ الْمُطَّلِبْ) م.

جا ئیمام (الْعَبّاس) رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ جڵەوی هێسترەکەی گرتبوو، (أَبُو سُفْيان بن الْحارِث)ش رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ، سەر پاڵوەکەی گرتبوو تا بەرەو پێش نەڕوا ئینجا پێغەمبەر ﷺ بە ئیمام (الْعَبّاس) ی فەرموو: هاوار بکە و بڵێ: هۆ (صَحابَة)کانی بن درەختەکەی (بَيْعَةُ الرِّضْوان) هۆ گەلی (أَنْصار) ی (مَدِينَة).

جا ئیمام (العباس) (رضي الله عنه) ئەم هاوارەی کرد کرد لەبەر ئەوەی دەنگێکی بەرزی هەبوو (صحابة)کان (رضي الله عنهم) گوێیان لێبوو و وەڵامیان داوە: (لَبَّيكَ، لَبَّيكَ) لە خزمەتین، لە خزمەتین، جا هەر ئەوەندە بوو کە گوێیان لەم هاوارەی ئیمام (العباس)بوو، دەستیان بە گەڕانەوە کرد و پیاوی وەها هەبوو: دەیویست وشترەکەی بسوڕێنێتەوە، بەڵام لەبەر پاڵەپەستەی خەڵکەکە نەیدەتوانی، بۆیە لە وشترەکەی دادەبەزی و زرێیەکەی فڕێ دەدا و تەنها شمشێر و قەڵغانەکەی بە دەستەوە دەگرت و بەرەو پێغەمبەر ﷺ دەگەڕاوە، تا سەد کەس لە دەوری پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوە و هێرشیان کردە سەر کافرەکان.

بەڵێ: ئەم سەد (صحابة)یە (رضي الله عنهم) لەگەڵ ئەو هەموو لەشکرە زۆرە کەوتنە جەنگکردن و شمشێر لێدان، جا کە پێغەمبەر ﷺ چاوی بەم جەنگە کەوت، فەرمووی: (الآنَ حَمِيَ الوَطِيسُ) ئێستا کوڕەی جەنگ گەرم بوو... جا پێغەمبەر ﷺ چەنگێکی وردە بەردی هەڵگرت و پرژاندیە لای کافرەکان و فەرمووی: (إِنْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍﷺ) کافرەکان هەڵاتن، سوێندم بە خوای (محمد)ﷺ.

ئیتر کافرەکان هەر یەکەو هەندێك وردە بەردیان کەوتە ناو چاوەکانیان و لەو



کاتیشدا خوای گەورە (ملائکة)ی ناردنە خوارێ، وەک عەبای ڕەش لە ئاسمانەوە دادەبەزین و لە ناو دۆڵەکەشدا وەک مێروو بڵاو دەبوونەوە.

ئیتر ئەم جارە کافرەکان خۆیان پێ ڕانەگیرا و بەزین و لە مەیدان هەڵاتن، (صحابة)ش (رضي الله عنهم) بە دوایاندا دەڕۆیشتن و دەیانکوشتن و دیلیان دەکردن، تاوای لێهات هەڵاتووەکانی موسڵمانان بە پەلبەستراوی کۆ کرابوونەوە. هەروەها (مالك بن عوف)ی سەرکردەی کافرەکانیش لە مەیدان هەڵات و چووە (طائیف)، لەوێ لەگەڵ کۆمەڵێکی سەرکردەکان لەناو قەڵای (طائیف)دا خۆیان قایم کرد. جا لەم غەزایەی (حنین)، پێغەمبەر ﷺ دیتی (أم سلیم)=(الرمیصاء) لەگەڵ (أبو طلحة)ی مێردی خۆی (رضي الله عنهما) هاتۆتە غەزاو خەنجەرێکی پێیە و دەیگوت: هەر کافرێک لێم نزیك ببێتەوە، بەم خەنجەرە زگی هەڵدەدڕم. جا پێغەمبەر ﷺ پێکەنی، (أم سلیم)ش گوتی: یا رسول الله، ئەوانەی لە جەنگ هەڵاتن دەیانکوژم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا جەنگی لە کۆڵ کردووینەوە و چاکەشی لەگەڵ کردووین. جا (أبو طلحة)ی مێردیشی (رضي الله عنها) بە تەنها بیست کافری کوشتبوون و کەل و پەلی هەموویانی بۆ خۆی هێنابوو.

## ناردنی نوێنەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ فێرکردنی ئیسلام

وەکو وتمان لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا وەفدی عەرەبەکان لە هەموو لایەکەوە ڕوویان لە (مەدینە) کرد و کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و دەبوونە موسڵمان... جا ئەو موسڵمانبووانەش پێویستیان بە مامۆستایانی ئایینی هەبوو، تاکوو لە ئایینی ئیسلام شارەزا ببن. بۆیە پێغەمبەر ﷺ بۆ هەر لایەک (صحابة)یەک، یان زیاتری دەنارد تاکوو خەڵکی فێری ئایینی ئیسلام بکەن و کاروباری دەوڵەتی ئیسلامیش لە جیاتی پێغەمبەر ﷺ لەوێ بەڕێوە ببەن. جا ئێمە هەموو ئەو نوێنەرانە باس ناکەین، بەڵکوو تەنها هەندێکیان باس دەکەین إِنْ شَاءَ الله .

## ناردنی (أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِي) و (مُعاذ بن جَبَل) (ﷺ) بۆ (یەمەن):

پێغەمبەر ﷺ ئەم دوو بەڕێزەی نارده یەمەن و فەرمووی: (يَسِّرا وَلَاتُعَسِّرا وَبَشِّرا وَلَا تُنَفِّرا - وفي رواية -: وَتَطاوَعا وَلا تَخْتَلِفا) ئاسانکاری بکەن و خەڵکی تووشی ناخۆشی و تەنگانە مەکەن، مژدەی خۆشی بدەن، خەڵکی لە ئیسلام مەڕەوێننەوە، بە قسەی یەکتری بکەن و ململانە و پەرتەوازەیی مەکەن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری (معاذ)ی (رضي الله عنه) کرد و فەرمووی: (تۆ دەچیە لای گەلێکی خاوەن (کِتاب)، جا یەکەمجار داوایان لێ بکە بڵێن: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله)، جا ئەگەر بە قسەیان کردی پێیان بڵێ:



خوای گەورە پێنج نوێژی لەسەر واجب کردوون لە هەموو شەوێک و ڕۆژێکدا، جا ئەگەر بە قسەیان کردی پێیان بڵێ:

خــوا زەکــاتی لەســەر دەوڵەمەنــدەکان واجــب کــردووە و لێیــان وەردەگیــرێ و دەدرێتەوە هەژارەکان، جا ئەگەر بە قسەیان کردی ئاگات لێبێ ماڵە باشەکەیان لە زەکات لێمەستێنە و لە دوعـای سـتەملێکراو بترسـە، چـونکە هـیچ پەردەیەک لە نێوان خودا و دوعای ستەملێکراودا نییە. (واتە: زوو قبووڵ دەبێت).

ئینجا پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ تا دەرەوەی (مەدینە) لەگەڵ (معاذ)دا (رضي الله عنە) ڕۆیشت و ئامۆژگاریی دەکرد و فەرمووی: (يا مُعاذُ إِنَّكَ عَسَى أَلّا تَلقانِي بَعْدَ عامِي هَذا، وَلَعَلَّكَ أَنْ تَمُرَّ بِمَسجِدِي هَذا وقَبرِي!) ئەی (معاذ) لەوانەیە: لە دوای ئەم ســاڵ هیچی تــر تــۆ مــن نەبینــیەوە، لەوانەیە: تــۆ بە لای ئەم مــزگەوتەم و گۆڕەکەمدا تێبپەڕی.

جا (معاذ) (رضي الله عنە) کەوتە گریان لە پەرۆشیی جیابوونەوەی پێغەمبەر ﷺ.

جـا پێغەمـبەر ﷺ ئـاوڕێکی لە (مەدیـنە) دایەوە و فەرمـووی: (إِنَّ أَوْلَى النَّـاس بِـي المُتَّقُونَ، مَنْ كَانُوا وَحيثُ كانُوا). [حديث صحيح رواه الإمام أحمد] بەڕاستی لە پێشترین کەس لە من، لەخوا ترسەکانن، هەر کەسێک بن و لە هەر کوێ بن.

جا لەوکات یەمەن لە دوو هەرێم پێک هاتبوو، هەر یەکێک لە (أبو موسی)و (معاذ) (ﭬ) چوونە هەرێمێک و جار جاریش سەردانی یەکتریان دەکرد، جا ڕۆژێک (معاذ) (رضي الله عنە) سەردانی (أبو موسی)ی (رضي الله عنە) کرد، دیتی (أبو موسی)

دانیشـتووە و خەڵـک لە دەورەیەتـی و پیـاوێکی پەلبەسـتکراویش لە لایەتـی، جـا (معاذ) (رضي الله عنه) فەرمووی: ئەم پیاوە چییە؟

(أبو موسی) (رضي الله عنه) فەرمووی: ئەمە لە دوای موسڵمانبوون کافر بۆتەوە، جا (معاذ) (رضي الله عنه) فەرمووی: (لَا أَجْلِسُ حَتَّى يُقتَلَ قَضاءُ اللّهِ وَرَسُولِهِ ﷺ - ثَلاثَ مَرَّاتٍ - فَأُمِرَ بِهِ فَقُتِلَ) [رواه البخاري ومسلم،] دانانیشـم هەتا ئەم کافربووە دەکوژرێ، کوشـتنی موسڵمانی کافربوو، بڕیاری خـوا و پێغەمبەرە ﷺ سێ جار وای فەرموو جا فەرمانی دا پیاوە کافربووەکە کوژرا.

جـا (أبـو موسـی) (رضـي الله عـنه) لە یەمەن گەڕاوە و لە مەکـکە لەکـاتی (حَجَّـة الـوَدَاع)دا بە خـزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشـت، بەڵام حەزرەتـی (معـاذ) (رضـي الله عـنه) هەر لە یەمەن مـایەوە تـا پێغەمبەر ﷺ وەفـاتی کـرد، هەروەک پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندبوو، ئینجا لە (خلافة)ی ئیمام (أبو بكر)دا (رضي الله عنه) گەڕاوە بۆ مەدینە.

## ناردنی هەردوو پێشەوا (علي) و (خالد) (رضي الله عنهما) بۆ (یەمەن):-

هەروەها پێغەمبەر ﷺ (خالد) (رضي الله عنه) ناردە یەمەن بۆ بانگەوازی ئیسلام، جا ماوەی شەش مانگ لەوێ مایەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئیمام (علي)ی (رضي الله عنه) بە دوادا نارد، تـاکو (خالـد) (رضي الله عنه) بگەڕێتەوە بـۆ (مەدینە) و ئەو لە جێی ئەو بـانگەواز بکـات، جـا پێغەمـبەر ﷺ فەرمـووی: ئەوانەی لەگەڵ (خالـد)ن:



هەر کەسێک پێی خۆشە با لەگەڵ ئەودا بگەڕێتەوە، هەر کەسێکیش پێی خۆش بێ با لەگەڵ تۆدا بمێنێتەوە.

جا (خالد) و کۆمەڵە (صحابة)یەک (رضي الله عنهم) گەڕانەوە، هەندێکیش لەگەڵ ئیمام (علي)دا لە یەمەن مانەوە (رضي الله عنهم).

جا هۆزی (هَمَدان) گشتی لەسەر دەستی ئیمام (علي) (رضي الله عنه) موسڵمان بوون، جا کە هەواڵی موسڵمانبوونیان گەیشتە پێغەمبەرﷺ، یەکسەر پێغەمبەر ﷺ سوجدەی شوکری بۆ خوا برد و فەرمووی: (السَّلامُ عَلَى هَمَدان، السَّلامُ عَلَى هَمَدان). جا پێش ئەوەی ئیمام (علي) (رضي الله عنه) بەڕێ بکەوێ بۆ یەمەن، گوتی: یا رسول الله من گەنجێکی تازە پێگەیشتووم و دەمنێریە لای کەسێکی لە خۆم بە تەمەنتر، هیچ زانستی (قضاء)= دادگاییم نییە؟ پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کرد و ڕێنموونی کرد و فەرمووی: (إذا جلَسَ إليكَ الخَصمَانِ ، فلا تَقضِ بَينَهُما حتَّى تسمَعَ منَ الآخَرِ كَما سمِعتَ منَ الأوَّلِ، فإنَّكَ إذا فَعَلتَ ذلِكَ تَبَيَّنَ لَكَ القَضاءُ). [حديث حسن رواه الإمام أحمد والترمذي]، هەر کاتێك دوو کێشەچی بۆ براندنەوەی کێشەکەیان لە لای تۆ دانیشتن، بڕیار لە نێوانیاندا مەدە، تا قسەی دووەمەکەشت گوێ لێ دەبێت وەك گوێ لێبوونی قسەی یەکەمەکە، تۆ ئەگەر ئەوها بکەی، بڕیاردانەکەت بۆ ڕوون دەبێتەوە. جا ئیمام (علي) (رضي الله عنه) فەرمووی: لەمەودوا هیچ بڕیارێکی دادوەریم لێ تێکەڵ نەبوو و نەکەوتمە گومان.

ئینجا کە پێغەمبەر ﷺ هاتە (حجة الوداع)، ئیمام (علي)ش لە یەمەن گەڕاوەو لە مەککە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ و ئیحرامی بەست[١].

## غەزای (تَبُوك) = (غَزْوَةُ العُسْرَة) = (جَيْشُ العُسْرَة)

ئەمەیان دواین غەزایەکانی پێغەمبەری سەروەرمانە ﷺ لە مانگی (رَجَب)ی ساڵی نۆیەمی کۆچیدا بوو.

هۆی غەزایەکەش ئەمەیە: هەواڵێک گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ کە کافرەکانی (رُوم) لەشکرێکی چل هەزار سەربازییان کۆکردۆتەوە و پێشەکی لەشکرەکەش گەیشتۆتە (الْبَلْقاء) لە نزيك (عَمَان).

بۆیە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمانی بە موسوڵمانان کرد خۆیان بۆ ئەم غەزایە ئامادە بکەن، پێغەمبەر ﷺ وەک غەزاکانی تر شوێنی غەزاکەی نەشاردەوە، بەڵکو شوێنی غەزاکەی بۆ ئاشکرا کردن تاکو بە تەواوی خۆیان ئامادە بکەن، چونکە کاتەکە سەرەتای پایز بوو، میوەی (مَدِينَة)ش پێگەیشتبوو، گەرما بەهێز بوو خەڵک پێی خۆش بوو لە سێبەرەکاندا پشوو بدا، ساڵەکەش نەهات بوو(وشکە ساڵی)، موسوڵمانەکانیش نەبوونی بوون، بۆیە بەم غەزایە دەگوترێ: (غَزْوَةُ العُسْرَة)= غەزای تەنگانە. بە لەشکرەکەش دەگوترێ: (جَيْشُ

---

[١] (البداية والنهاية) ب(٣) ل(١٦٣و١٧٢)].



العُسْرَة)= لەشکری تەنگانە، چونکە شوێنی غەزاکە دوور بوو و ڕێگاکەش سەخت و گەرم بوو.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمانەکانی (مَكَّة) و (مَدِينَة) و هۆزەکانی تر، بەوپەڕی خۆ نەویستی و دونیا نەویستی بۆ ئەم غەزایە کۆ بوونەوە، ژمارەی لەشکری ئیسلام گەیشتە ٣٠ سی هەزار جەنگاوەر.

جا پێغەمبەری خوا ﷺ هانی دەوڵەمەندەکانی دا بۆ دابینکردنی بژێوی ئەم لەشکرە زۆرە و بۆ یارمەتیدانی جەنگاوەرەکان لە هەموو بوارێکی سەربازییەوە، فەرمووی: (مَنْ جَهَّزَ جَيْشُ العُسْرَة غَفَرَ اللهُ لَهُ) [رواه النسائي بسند صحيح،] هەر کەسێک پێویستیەکانی لەشکری (العُسْرَة) ئامادە بکات خوا لێی خۆش دەبێ، جا موسوڵمانەکان بە گوێرەی توانای خۆیان پارە و خواردەمەنی و کەرەستەی جەنگیان دەهێنا، تا ئافرەتانیش خشڵی خۆیان دەبەخشی.

جا یەکەم کەس ئیمام (أبُو بَكْر) (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) هەموو ماڵی خۆی هێنا کە چوار هەزار دەرهەمی زیو بوو، ئیمام (عُمَر)ش (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) نیوەی ماڵی خۆی هێنا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی (أبُو بَكْر) چەندت بۆ منداڵەکانت هێشتۆتەوە؟ ئیمام (أبُو بَكْر) فەرمووی: خوا و پێغەمبەرم ﷺ بۆ هێشتوونەتەوە، جا ئیمام (عُمَر)ش (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فەرمووی: زانیم من هیچ کاتێك پێش (أبُو بَكْر) ناکەوم.

هەروەها دەوڵەمەندەکانی تریش پارە و خورمایەکی زۆریان هێنا، بەڵام لە هەمووان باڵا دەستتر ئیمامی (عثمان) بوو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) چونکە ئەو پەنجا

ئەسپ و سێ سەد وشتری بە تەواوی بارگە و کەلوپەلەوە هێنان، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اللّهُمَّ ارضَ عَنْ عُثمانَ فَإنِّي عَنْهُ راضٍ) خودایە لە (عثمان) ڕازی ببە، چونکە من لێی ڕازیم. ئینجا ئیمام (عثمان) (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) هەزار دینار = میسقاڵ زێڕیشی هێنا و ڕژاندیە ناو کۆشی پێغەمبەر ﷺ جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی خۆی هەڵگێڕ و وەرگێڕی بە زێڕەکە دەکرد و دەیفەرموو: (مَا ضَرَّ عُثمان مَا فَعَلَ بَعْدَ اليَوْمِ) [حديث حسن رواه الترمذي،] زیان لە (عثمان) نادا هەر کردەوەیەکی لە ئەمڕۆ بەدواوە بیکا.

لەم غەزایەدا موسڵمانان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ بەشداری کردن، بەڵام دڵ نەخۆشان و دووڕووەکان خۆیان دزییەوە و نەڕۆیشتن بۆ جەنگ، و سێ لە هاوەڵان بەبێ هیچ بیانوویەک خۆیان لە جەنگەکە دواخست کە بریتی بوون لە کەعبی کوڕی مالیک و مەڕارەی کوڕی ڕەبیع و هیلالی کوڕی ئومەییە، کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە جەنگەکە گەڕایەوە، دووڕووەکان دەهاتن و هەریەک بە بیانوویەک پاکانەیان دەکرد، بەڵام ئەو سێ هاوەڵە هیچ بیانوویەکیان نەبوو و دانیان بە هەڵەی خۆیاندا نا، پێغەمبەر ﷺ فرمانیدا کە کەس قسەیان لەگەڵدا نەکات و دەبێت نەچن بەلای خێزانەکانیاندا، ئەم ڕووداوە پەنجا شەوی خایاند تا ئەوکاتەی ئایەتی ١١٨ لە سوورەتی التوبة دابەزی و خوای گەورە دەفەرموێت: (وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّىٰ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنْفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لَا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ) واتا:



هەروەها تەوبەی ئەو سێ کەسەشی وەرگرت کە لە غەزای تەبووک دواخران دوای ئەوەی کە زەوی بەو فراوانییەوە لێیان تەنگ ببوو، دڵنیاش بوون کە هیچ پەنایەک نییە لە تورەیی خوا بیانپارێزێت جگە لەوەی خۆیان بدەنە پەنای ئەو زاتە، پاشان تەوبەی لێوەرگرتن، بەڕاستی هەر خوا تەوبە وەرگر و میهرەبانە.

سەرەڕای ئەو هەموو سەختییەی کە موسڵمانان پێیدا تێپەڕین بەهۆی دووری ڕێگا و کەمی ئاو و خواردن و گەرما و وشکە ساڵی و کەمی هۆکاری گواستنەوەیان سوپاس بۆ خوای گەورە جەنگی تەبووک بە سەرکەوتنی هێزی موسڵمانان و بە هەڵهاتنی سوپای ڕۆم کۆتایی هات.

کاتێک موسڵمانەکان گەیشتنە تەبووک و سوپای ڕۆم بە گەیشتنیانی زانی ڕاستەوخۆ هەڵهاتن و بوێریان نەبوو بڕۆنە پێشەوە و شەڕ بکەن، بەو شێوەیە بەبێ ئەوەی یەک خوێنێ بڕێژرێ غەزای تەبووک بە سەرکەوتنی موسڵمانان کۆتایی هات.

و چەند شوێنێکی ژێردەستەی داگیرکاری ڕۆمەکان چۆڵ بوو و سەرۆک هۆزەکانیان پەیماننامەیان لەگەڵ پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ واژوو کرد. دوای ئەم جەنگە شکۆی ڕۆمەکان لە شام و نیمچە دوورگەی عەرەبی شکا، چونکە پێش ئەم جەنگە بەو هێزە ناسراوبوون کە ناڕوخێن و لە جەنگ هەڵنایەن.

دوای ئەم جەنگە پێگەی موسڵمانان بەهێزتر بوو لە نێو نیمچە دوورگەی عەرەبی و زۆرێک لە هۆزەکانی ناوچە جیاجیاکان باوەڕیان بە ئیسلام دەهێنا. جەنگی

تەبووک دەستپێکی جەنگەکان بوو لەگەڵ ڕۆم، هەرچەندە سەرەتا خۆیان دەستپێشخەریان کرد کاتێک کە نێردراوەکەی پێغەمبەری سەروەرمان  ﷺ (حارثی کوڕی عەمرو)یان کوشت.

و پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەم جەنگە فرمانی کرد کە فەتحی شام بکرێت، دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ئەم وەسێتەی جێبەجێ کرا و لە سەردەمی ئەبو بەکری صدیق سوپایەک بە سەرکردایەتی ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثە ئامادە کرا و شام بە چەند قۆناغێک فەتح کرا.

## حەج کردنی پێشەوا ئەبو بەکر و هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکان

لە مانگی ذي القعدە یان ذي الحیجەی ساڵی ٩ی کۆچی پێغەمبەری سەروەرمان  ﷺ پێشەوا ئەبو بەکری وەکو میرێک نارد بۆ حەج، و بۆ ئەوەی مەناسکەکانی حەج فێری خەڵکی بکات.

پاشان سەرەتاکانی سورەتی براءة دابەزی بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکان، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی طاڵیبی نارد، و ئەویش لە ڕێگا بە ئەبو بەکر گەیشت و بەیەکەوە ڕۆیشتن بۆ مەککەی پیرۆز، لە ڕۆژی قوربانی کردن عەلی کوڕی ئەبی طاڵیب لە حجرە وەستا و بانگی خەڵکی کرد و پەیامەکەی پێغەمبەری سەروەرمانﷺی بە خەڵکی گەیاند.



پێشـەوا ئەبـو بەکـریش چەنـد پیـاوێکی نـارد بە خەڵکی ڕابگەیەنـن لە سـاڵی داهـاتوو هیچ کەسێک بە ڕووتی طەواف نەکات لە دەوری کەعبەی پیرۆز.

ئەم بانگەوازە کۆتایی و مەرگی بتپەرستی بوو لەناو نیمچە دوورگەی عەرەبیدا.

## بە کۆمەڵ موسڵمان بوونی خەڵکی

غەزای فەتحی مەککەی پیرۆز شـەڕی یەکلاکەرەوە بـوو و بە تەواوی بـت پەرسـتی لەنـاو بـرد، بەهـۆی ئەو فەتـحەوە عەرەب ڕەوا و نـاڕەوای لەیەک جیـا کـردەوە و دڵەڕاوکـێ و گومـانی نەمـا و بەخێرایـی هـاتنە نـاو ئـاینی پیـرۆزی ئیسـلامەوە، و شـاند(وەفد)ی زۆر لە زۆربەی تیـر و کۆمەڵەکـان ڕۆیشـتنە خزمەتـی پێغەمـبەری خـوا ﷺ و بەڕێگەی جیـاواز موسـڵمان بـوونی خۆیـان ڕاگەیانـد و سیرەت ناسـان ئەوەی باسـیان کـردووە لە ٧٠ شـاند زیـاتر بـوونە، کە زۆربەیـان دوای فەتحی مەکـکەی پیـرۆز ڕۆیشـتنەتە خـزمەت پێغەمـبەری سـەروەرمان ﷺ، و کۆمەڵێکیش پێش فەتحی مەککە ڕۆیشتوون.

ژمـارەی موسـڵمان بە ڕادەیەکی زۆر بەرچـاو زیـادی کـرد بەشـێوەیەک بـوو لە کاتی فەتحی مەککەی پیرۆز ژمارەی سـوپای ئیسـلام ١٠ هەزار کەس بـوون، و لە غەزای تەبـووک ٣٠ هەزار کەس بـوون لە کاتێکـدا نێـوانی هەردوو غەزاکە سـاڵێک کەمتر بـوو، و لە حەجـی ماڵئاواییـدا دەریـایەک لە موسـڵمانان لە دەوری پێغەمـبەری خـوا ﷺ کۆبوونەوە کە ژمارەیان ١٠٠ هەزار یان ١٤٠ هەزار کەس دەبوون.

## حەجی ماڵئاوایی (حَجَّةُ الوَداع)

ئەم حەج کردنەی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ چەند ناوێکی هەیە ئەواتیش:

(حجة الوداع) حەجی ماڵئاوایی، چونکە پێغەمبەر ﷺ ماڵئاوایی لە موسڵمانان کرد و هیچ حەجی تری نەکرد.

(حجة البلاغ) حەجی ڕاگەیاندن، چونکە لەم حەجەدا پێغەمبەر ﷺ بە کردار و گوفتار شەرعی خوای بە خەڵک ڕاگەیاند و فەرمووی: (هل بلغت؟) ئایا ڕامگەیاند؟..

(حجة الإسلام) حەجی ڕوکنی ئیسلام، چونکە لەدوای واجببوونی حەج، پێغەمبەر ﷺ تەنیا ئەم حەجەی کردوە، واتە: ئەو حەجانەی پێش واجب بوونی حەج لە مەککەدا کردبوونی، حەجی ڕوکنی ئیسلام نەبوون.

جا بزانە پێغەمبەر ﷺ چوار عومرەی کردوون:

یەکەم: (عمرة)ی (الحديبية) لە مانگی (ذي القعدة) ساڵی شەشەمی کۆچی.

دووەم: (عمرة القضاء) لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی حەفتەمی کۆچی.

سێیەم: (عمرة)ی (الجعرانة) لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی هەشتەمی کۆچی.

چوارەم: ئەو (عمرة)ی لەگەڵ (حجة الوداع) لە مانگی (ذی الحجة)ی ساڵی دەیەمی کۆچی ئەنجامیدا.

دیسان بزانە: پێغەمبەری خوا ﷺ نۆ ساڵان لە مەدینە مایەوە، هیچ حەجی نەکرد.



ئینجا لە ساڵی دەیەمی کۆچی دا بە خەڵکی ڕاگەیاند ئەمساڵ پێغەمبەر ﷺ حەج دەکات.

بۆیە خەڵکێکی زۆر ڕووی کردە مەدینە، تاکوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ حەج بکەن. ژمارەیان لە هەندێ (روایة)دا: چل هەزارە، لە هەندێ (روایة)دا: نەوەد هەزارە، لە هەندێ (روایة)دا: سەدو چواردە هەزار بوون، (ریوایة)ی تریش هەنە.

## کورتەیەکی حەجی پێغەمبەرﷺ:-

لە سەفەری (حَجَّةِ الْوَداع)دا پێغەمبەر ﷺ هەموو ژنەکانی خۆی لەگەڵ خۆیا بردن بۆ حەج کردن، هاوەڵ (أبُو دُجانَة)شی (رَضِي اللهُ عَنهُ) کردە جێنشینی خۆی لە (مَدِينَة).

جا پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی شەممە بیست و پێنجی مانگی (ذِی الْقَعْدَة)ی ساڵی دەیەمی کۆچی نوێژی نیوەڕۆی لە (مَدِينَة) بە چوار ڕەکعەتی کرد، ئینجا لە دوای نیوەڕۆ لە (مَدِينَة) بەڕێکەوت، تا گەیشتە (ذَی الْحُلَيْفَة). لەوێ نوێژی عەسری بە (قَصْر) دوو ڕەکعەتی کرد، ئینجا شەو لە (ذَی الْحُلَيْفَة) مایەوە و نوێژەکانی مەغریب و عیشا و سبەینێی لەوێ کردن، ئینجا هەر لە (ذَی الْحُلَيْفَة) مایەوە تا نوێژی نیوەڕۆشی لەوێ کرد، ئینجا دوو ڕەکعەت سوننەتی لە پێش ئیحرام بەستدا کرد و سواری وشترەکەی بوو، ئینجا لەسەر پشتی وشترەکەی ئیحرامی بەست و دەستی بە (لَبَّيْكَ) کرد و بەرەو (مَكَّة) ڕۆیشتن. ئینجا لە بەیانی ڕۆژی یەکشەممەی

چواری مانگی (ذِی الحِجَّة) چوونە ناو (مَكَّة)، چونكە مانگی (ذِی الْقَعْدَة) كەمە مانگ بوو، بۆیە بە (إجْماع)ی هەموو مسوڵمانان: شەوی پێنج شەممە یەكەم شەوی مانگی (ذِی الحِجَّة) بوو، ڕۆژی جومعەی نۆی مانگ وەستانی (عَرَفَة) بوو. جا پێغەمبەر ﷺ یەكسەر (طَواف)ی كرد و (سَعي)ی نێوان (صَفا) و (مَرْوَة)شی كرد، ئینجا ڕۆژانی دووشەممە و سێشەممە و چوارشەممە= پێنجەم و شەشەم و حەوتەمی (ذِی الحِجَّة)، لە (مَكَّة) دا مایەوە، ئینجا لە ڕۆژی پێنجشەممەی هەشتی (ذِی الحِجَّة) چووە (مِنَى)، نوێژەكانی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا و هەروەها بەیانی جومعەی لە (مِنَى) كردن، واتە: شەوی جومعەی نۆی (ذِی الحِجَّة) لە (مِنَى) مایەوە، ئینجا لە ڕۆژی جومعەی نۆی (ذِی الحِجَّة) چووە (عَرَفات) و نوێژەكانی نیوەڕۆ و عەسری بە (قَصْر) و (جَمْع) لەوێ كردن و تا دوای ڕۆژئاوا بوون لە (عَرَفات) مایەوە، ئینجا شەوی شەممەی دەی (ذِی الحِجَّة) لە (عَرَفات) گەڕاوە بۆ (مُزْدَلِفَة)، ئینجا بەیانی شەممە= دەی (ذِی الحِجَّة) لە (مُزْدَلِفَة)وە هاتە (الْمَشْعَرُ الْحَرام) و لەوێشەوە هاتە (مِنَى) و شەیتانی گەورەی (رَجْم) كرد، ئینجا هاتەوە (مَكَّة) و (طَواف الإفاضَة)ی كرد، ئینجا گەڕاوە بۆ (مِنَى)، یەكشەممە و دووشەممە= یازدە و دوانزەی (ذِی الحِجَّة) لە (مِنَى) مایەوە و لە ڕۆژی سێ شەممەی سێزدەی (ذِی الحِجَّة) لە (مِنَى) ڕۆیشت و هاتەوە (مَكَّة) ئینجا لە ڕۆژی چوارشەممەی چواردەی (ذِی الحِجَّة) لە (مَكَّة) هاتە دەرەوە و گەڕاوە بۆ (مَدِينَة)، واتە: دە ڕۆژان لە حەج كردن ماوەتەوە.



جـا مەبەسـتی (أنَـس بـن مالِـك)یش (رَضِـي اللهُ عَنـهُ) هەر ئەم دە ڕۆژانەیە، کە فەرموویەتی: (خَرَجْنا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعْنا إِلَى الْمَدِينَةِ، قُلْتُ: كَمْ أَقامَ بِمَكَّة؟ قال: عَشْراً) رواه الشيخان. لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بۆ حەج کردن لە (مَدِينَة) وە چوینە (مَكَّة) پێغەمبەر ﷺ نوێژەکانی کورت دەکردنەوە و دوو ڕەکعەت دوو ڕەکعەتی دەکردن تا گەڕاینەوە (مَدِينَة)... جا گـوتی: مـاوەی دە ڕۆژان لە (مَكَّـة) دا -واتە: لە حەج کـردنەکەدا- مـایەوە. کەواتە پێغەمبەر ﷺ -جگە لە ڕۆژی هـاتن- سێ ڕۆژی تەواو بە دوای یەکدا لە نـاو شـاری (مَكَّـة) دا مـاوەتەوە، حەوت ڕۆژەکەی تـر لە دەوروبەردا بـۆ حەج کـردن مـاوەتەوە. ئەمەی ڕابردوو کورتەی حەجی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ بوو، لە (صحيح البخاري) و (صحيح مسلم) دا.

بـۆیە ئەوها بە وردیم ڕوون کـردەوە چـونکە لەم سـەردەمەدا چەنـد کەسـانێکی بێ ئاگا – بە نـاوی شـارەزاکارێکی ئـایینی- لەگەڵ کاروانی حاجیەکانـدا دەڕۆنە حەج، لە هەمـوو حاڵەتێکـدا (قَصْـر) و (جَمْـع) بە حـاجیەکان دەکەن و دەڵـێن: پێغەمبەر ﷺ لە (حَجَّـة الْـوَداع)دا (قَـصْـر) و (جَمْـع)ی کـردووە، ئەم حەدیـثەی ڕابـردووی (أَنَـس) (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) دەکەنە بەڵگە.

## وتارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە (حَجَّةُ الوَداع)

پێغەمبەر ﷺ لە (عرفات) وەستا ئینجا لە کاتی نیوەڕۆدا لەسەر پشتی وشترەکەی وتارێکیدا بۆ ئەو هەموو موسڵمانانەی لە (عرفات) وەستابوون و فەرمووی: «ئەی خەڵکینە گوێ بدەنە قسەی من، من نازانم لەوانەیە لە دوای ئەمساڵ لەم شوێنە هەتا هەتایی بەیەک نەگەینەوە.

خەڵکینە خوێنتان و ماڵتان لە یەکتری حەرامە وەک حەرامیی ئەم ڕۆژەی (عَرَفَة) لەم مانگەدا لەم شارەی (مەککە)دا.

ئاگادار بن هەر کارێکی سەردەمی نەفامی پێش ئیسلام هەبێت، گشتی لە ژێر پێی مندایە و بێ نرخە.

خوێن سەندنەوەی سەردەمی نەفامیش لابراوە، یەکەم خوێنیش کە لە خوێنەکانی بنەماڵەی خۆمان لای دەبەم خوێنی (ابن رَبِيعَة)یە.

هەروەها سوو(ڕیبا)ی نەفامیش لابراوە، یەکەم ڕیبا کە لای دەبەم ڕیبای (العباس بن عبد المطلب)ی مامی خۆمە، ئەو ڕیبایە هەمووی لابراوە.

واتە: نابێت هیچی وەربگیرێ.

خەڵکینە، شەیتان بێ ئومێد بووە لەوەی جارێکی تر لەم زەمینەی ئێوەدا بپەرسترێ، بەڵام ئەگەر شەیتان – جگە لە پەرستن – بە گوێی بکرێ، ئەوە لێتان ڕازی دەبێ بەو گوناهانەی ئێوە بە کەمیان دەزانن، کەوابوو: لەبارەی ئاینەکەتان لە شەیتان بترسن....



لەبارەی ژنەکانتان لە خوا بترسن،

چـونکە ئەوانتـان بە ئەمـانەتی خـوا وەرگرتـوون و بە فەرمـوودەی خـوا عەورەتـی ئەوانتان حەڵاڵ کردووە،

ئێوە مافتان لەسەر ژنەکانتان هەیە،

ژنەکانیشتان مافیان لەسەر ئێوە هەیە،

مـافی ئێـوە ئەوەیە: ژنەکانتـان هـیچ کەسـێک نەهێنـنە ماڵەکەتـان کە ئێـوە پێتـان نـاخۆش بێـت، جـا ئەگەر وایـان کـرد لێیـان دەن بە لێـدانێکی بـێ شـکاندن و بـێ برینـدار کـردن، مـافی ژنەکانیشـتان ئەوەیە: بژێـوی و بەرگیـان بـدەنێ بە گـوێرەی تواناتان....

خەڵکینە، لە قسەکانم تێبگەن،....

من پێم ڕاگەیاندن و شتێکی وەهاشم لە دوای خۆم بۆ ئێوە هێشتۆتەوە، تا دەستی پێوە بگرن ئێوە گومڕا نابن،

ئەویش قورئانی خودایە و فەرمودەکانی پێغەمبەری خودایە ﷺ.

خەڵکینە، گوێڕایەڵی گەورەکانی خۆتان بن، هەرچەند قەڵەڕەشێکی لـووت بڕاویش بکرێتە گەورەتان، بەو مەرجەی ڕەفتار بە قورئانی پیرۆز بکات.

خەڵکینە، گوێتان لە قسەکانم بێ و لێی تێبگەن، دەزانن گشت موسڵمانێک برای موسڵمانە، موسڵمانان هەموویـان بـرای یەکترین، ماڵی هـیچ موسڵمانێک بـۆ هـیچ کەسێك حەڵاڵ نییە، تەنیا ئەگەر بە خۆشی دڵی خـۆی ماڵەکەی بداتێ، ئەوکات

حەڵاڵ دەبێت، کەوابوو ستەم لە یەکتری مەکەن، خودایە تۆ شاهید بە، ئێوە دەگەڕێنەوە لای خوا، نەکەن لە دوای من گومڕا بن و یەکتری بکوژن.

خەڵکینە، خوای ئێوە یەک خوایە، باوکتان یەک باوکە، هەمووتان لە (آدم)ن، (آدم)ش لە گڵ دروست کراوە، ڕێزدارترتان لە لای خوا لە خوا ترسترتانە، هیچ عەرەبێک لە هیچ عەجەمێک – کە عەرەب نەبێ – گەورەتر نییە تەنها بە لەخوا ترسان نەبێت. ئاگادار بن! ئەوەی لێرە ئامادەیە، با ئەم وتارەم بگەیەنێتە ئەوەی لێرە نییە، جا ئێوە لە بارەی من پرسیارتان لێ دەکرێ، ئێوە چی دەڵێن؟).

(صَحابَة)کان (رَضی أاللّهّ عَنهمُ) فەرموویان: شاهیدی دەدەین: بە ئێمەت ڕاگەیاند، جێبەجێت کرد، ئامۆژگاریت کرد. جا پێغەمبەر ﷺ پەنجەی شەهادەی سێ جار بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و بۆ لای خەڵکەکە دەیهێنا خوارەوە و دەیفەرموو: (خودایە تۆ شاهید بە). ئینجا کە پێغەمبەر ﷺ وتارەکەی تەواو کرد، فەرمانی کرد (بِلال) بانگی نیوەڕۆی دا، ئینجا ئیقامەتی کرد و نوێژی نیوەڕۆی بە (قَصْر) کرد، ئینجا ئیقامەتێکی تری کردو نوێژی عەسریشی بە (جَمْعُ التَّقْدِيم) کرد. جا پێغەمبەر ﷺ هەر لە (عَرَفات) بوو و لە دوای نوێژی عەسر ئایەتی (اليَوْمَ أكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ)ی بۆ هاتە خوارەوە، ئینجا لە دوای ڕۆژئاوا بوون لە (عَرَفَة) گەڕاوە بۆ (مُزْدَلِفَة) و (مِنَى)، ڕوکن و واجبەکانی حەجی تەواو کردن، ئینجا لە چواردەی مانگ گەڕایەوە بۆ (مَدِينة). هەر وەک ڕونمان کردەوە.



وتارەکەی (غَدیرُ خُم) لەبارەی گەورەیی ئیمام (عَلي) (رَضی اَللهَّ عَنه) ئینجا لە ڕێگەی گەڕانەوەی دا لە (غَدیرُ خُم)- لە نێوان (مَکَّة ) و (مَدِینة)- لە ڕۆژی یەکشەممە هەژدەی (ذی الْحَجة)، پێغەمبەر ﷺ (صَحابَة)کانی کۆکردنەوە و وتارێکی بۆ دان و لە وتارەکەیدا گەورەیی ئیمام (عَلي) (رَضِي اللهُ عَنهُ) بۆ باس کردن فەرمووی:

(ئەی خەڵکینە منیش وەکو ئێوە ئادەمیزادێکم، نزیک بووەتەوە لە لای خواوە بانگەوازی مردنم بۆ بێ و منیش وەڵام بدەمەوە، دوو شتی زۆر قورس و بە قەدرم لە دوای خۆم بۆ ئێوە هێشتووەتەوە، یەکێکیان لەوی تر گەورەترە: کە قورئانی خودایە، ئەوی تریش (أَهْلُ أَلْبَیْت)= بنەماڵەی منە، تەماشا بکەن لەگەڵ ئەم دوانەدا لە دوای من چۆن ڕەفتار دەکەن؟ ئەم دوانە لێک جیا نابنەوە، تا وێکڕا لەسەر حەوزی کەوسەر دێنە لای من.... ئینجا فەرمووی: خوای گەورە دۆست و خۆشەویستی منە، منیش دۆست و خۆشەویستی گشت ئیمانداریێکم...

ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەستی ئیمام {عَلي} (رَضِي اللهُ عَنهُ) گرت و فەرمووی: (مَنْ کُنْتُ مَوْلَاهُ فَهذا-أَي عَليُّ-مَولاهُ اَللَّهُمَّ والِ مَنْ والاهُ وعادِ مَنْ عاداهُ وَانْصُرْ مَنْ نَصَرَهُ، وَاخْذُلْ مَنْ خَذَلَهُ) [حَدیث صحیح رواه ایمام احمد ولنسائی وبن ماجه].

هەر کەسێک من دۆست و خۆشەویستی بم، ئەمەش واتە: {عَلي} دۆست و خۆشەویستیەتی، خودایە دۆستایەتی ئەو کەسە بکە و خۆشت بوێ کە

دۆستایەتی {عَلي} دەکا و خۆشی دەوێ، خودایە یارمەتی ئەو کەسە بدە کە یارمەتی {عَلي} دەدا، ئەو کەسەش سەر شۆڕ بکە: کە هەوڵی سەر شۆڕکردنی {عَلي} دەدا.

## دوایین نێردراو (سریەکەی ئوسامەی کوڕی زەید_شەڕی ڕووم)

ڕۆمەکان دوای ئەوەی بە موسڵمانانیان ناوێرا هەستان بە کوشتنی هەر کەسێک موسڵمان ببووایە هەروەکو فروەی کوڕب عەمروی جذامیان شەهید کرد کە والی ڕۆمەکان بوو بەسەر مەعانەوە.لە مانگی (صفر) ساڵی یازدەی کۆچی، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد موسڵمانان خۆیان ئامادە بکەن بۆ غەزای (رُوم).

(أسامة)ی کوڕی (زید)شی دیاری کرد بۆ سەرکردەی لەشکرەکە.

ئینجا لە ڕۆژی سێیەمی ئامادەبوونی لەشکرەکە واتە لە ڕۆژی چوارشەممەی کۆتایی مانگی (صفر) ساڵی یازدەی کۆچی پێغەمبەر ﷺ تا و سەرئێشە گرتی، جا لە ڕۆژی پێنجشەممەی یەکەمی (ربیع الاول) پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی خۆی ئاڵای جەنگی بۆ (أسامة) بەست و فەرمووی: «بەناوی خوا لە ڕێگای خوا غەزا بکە، جەنگ لەگەڵ ئەو کەسانە بکە کە کوفر بە خوا دەکەن، بڕۆ ئەو شوێنەی باوکت لێی کوژراوە، تۆم کردە سەرکردەی ئەم لەشکرە، هێرش بکە سەر خەڵکی (أُبْنَى)، لە ڕێگەشدا بە پەلە بڕۆ».

جا (أسامة) لە دەرەوەی مەدینە سەربازگەی دانا و ژمارەی لەشکرەکە سێ هەزار (صحابة) بوو، لەوانە حەوت سەد (صحابة)ی (قریش) بوون (رضي الله عنهم).



گەورە پیاوانی (مهاجر) و (أنصار)ی لەگەڵدا بوون وەک: ئیمام (أبو بکر) و ئیمام (عمر) و (أبو عبیدة بن الجراح) و حەزرەتی (سعد بن أبي وقاص)...هتد.

جا هەندێکیان بە سەرکردایەتی (أسامة) (رضي الله عنه) ناڕازی بوون، چونکە تەمەنی (أسامة) (رضي الله عنه) هەژدە ساڵان بوو و گوتیان: پێغەمبەر ﷺ ئەم مندالە دەکاتە سەرکردەی (مهاجر) و (أنصار)!.

جا کە ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر تورە بوو، بۆیە لە ڕۆژی شەممەی دەی (ربیع الأول) هاتە سەر مینبەری مزگەوت لەبەر نەخۆشیش بە پەڕۆکێک سەری خۆی بەستبوو، جا فەرمووی: (ئەوە چییە؟ لەبارەی شازادەیی (أسامة) قسەیەکم لە ئێوە پێ گەیشتووە، ئەگەر ئێوە ئێستا تانە لە شازادەیی (أسامة) دەدەن، پێشتریش تانەتان لە شازادەیی باوکی (أسامة) داوە، سوێندم بەخوا باوکی (أسامة) شیاوی شازادەیی بوو، لەو کەسانەش بوو کە لە هەموو کەسێک لە لای من خۆشەویستترن، (أسامة)ش لە دوای باوکی شیاوی شازادەیەتییە و لەو کەسانەیە کە لە هەموو کەسێک لە لای من خۆشەویستترن، ئامۆژگاریتان دەکەم لەگەڵ (أسامة) چاک بن).

جا بە هۆی ئەم فەرموودەیە بە (أسامة)ی کوڕی (زید) (رضي الله عنهم) دەگوترا: (الحِبُّ ابنِ الحِبِّ) خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست.

ئینجا لە دوای وتارەکە پێغەمبەری سەرورمان ﷺ چووە ماڵەوەی و نەخۆشییەکەی زیاتر گران بوو و بێهێزی کرد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئیمام (أبو بکر)ی

(رضـي الله عـنـه) لە لەشـكرەكە جیـا كـردەوە و فەرمـانی كـرد بگەڕێـتەوە تـاكو لە جیاتی ئەو پێشنوێژی بۆ (صحابة)كان بكا (رضي الله عنهم).

جا پێغەمبەر ﷺ نەخۆشییەكەی هەر گرانتر دەبوو و دەیفەرموو:

لەشـكری (أسـامة) بنێـرن. ئینجـا لە ڕۆژی دووشـەممە دوانـزەی (ربيـع الأول) پێغەمبەر ﷺ وەفاتی كرد، لەو كاتیش لەشكری (أسامة) خەریكی بەڕێكەوتن بـوو، جـا كە هەواڵی وەفـاتی پێغەمبەریـان ﷺ پێگەیشـت نەڕۆیشـتن و لە سـەربازگەكەدا مـانەوە، ئینجـا هەر لە ڕۆژی دووشـەممە ئیمـام (أبـو بكـر) (رضـي الله عـنـه) كـرایە (خلیفـة)= جێنشـینی پێغەمـبەر ﷺ. جـا لە دوای وەفـاتی پێغەمـبەر ﷺ زۆربەی عەرەبەكـان كـافر بـوونەوە و (منافق)ەكـان خۆیـان وەدەرخسـت و دونیـا لە موسـڵمانان بەرتەنـگ بـوو، بـۆیە (صـحابة)كان (رضـي الله عـنه) داوایـان لە ئیمـام (عمـر) (رضـي الله عـنه) كـرد: بە ئیمـام (أبـو بكـر) (رضـي الله عـنه) بڵێ: لەشـكری (أسامة) نەنێرێ و بیگەڕێنێتەوە؟ بەڵام ئیمام (أبو بكر) (رضي الله عنه) فەرمووی: وَاللّٰهِ ئەو ئـاڵایەی پێغەمـبەر ﷺ بەسـتوویەتی هەڵیناوەشـێنمەوە، ئەگەر باڵـنـدە بمانفرێنن و دڕندەش لە دەرەوەی مەدینە بن و سەگەكان دایكەكانی ئیمانداران بە قاچیان ڕابكێشن من لەشكری (أسامة) هەر دەنێرم.

جا ئەم جارەش هەندێك لەو كەسانەی وتاری پێغەمبەریان ﷺ پێ نەگەیشتبوو، تكایـان لە ئیمـام (عمـر) (رضي الله عـنـه) كـرد: بە ئیمـام (أبـو بكـر) (رضـي الله عـنـه) بڵێ: یەكێكی بە تەمەنتر لە جێی (أسامة) بكاتە ئەمیری لەشكرەكە؟ جـا كە ئیمـام



(عمر) (رضي الله عنه) ئەم داوایەی کرد، ئیمام (أبو بکر) (رضي الله عنه) ڕیشی ئیمام (عمر)ی گرت و فەرمووی: ئەی کوڕی الخطاب دایکت زگ سووتاو بێ، چۆن جگەلە ئەمیری پێغەمبەر ﷺ ئەمیرێکی تر دابنێم؟!.

ئیتر ئیمام (أبو بکر) (رضي الله عنه) لە یەکی مانگی (ربيع الآخر)ی ساڵی یانزەی کۆچی لەشکرەکەی بەڕێکرد بەرەو أُبُنَى و بەخۆیشی ڕێگەی سەعاتێک بۆ ماڵئاوایی لەگەڵیان چووە دەرەوەی مەدینە و لە ڕێگەدا بە پیادەیی لە تەنیشت (أسامة) (رضي الله عنه) دەڕۆیشت، (أسامة)ش (رضي الله عنه) بە سواری دەڕۆیشت، جا هەر چەند (أسامة) (رضي الله عنه) هەوڵیدا دابەزێ و ئەویش بە پیادەیی بڕوا، پێشەوا (أبو بکر) رضي الله عنه) فەرمووی: والله نابێ دابەزی.

جا پێشەوا (أبو بکر) (رضي الله عنه) تکای لە (أسامة) کرد ڕێگە بدات پێشەوا (عمر) (رضي الله عنه) بگەڕێتەوە تاکوو لە مەدینە یارمەتیی بدا.

جا (أسامة)ش (رضي الله عنه) ڕێگەیدا پێشەوا (عمر) بگەڕێتەوە، بۆیە کە پێشەوا (عمر) (رضي الله عنه) چاوی بە (أسامة) دەکەوت، دەیفەرموو: (السلام عليك أيها الأمير). ئینجا (أسامة) (رضي الله عنه) بیست شەو ڕۆیشت و گەیشتە (أُبُنَى) لە شام و لەوێ لەگەڵ کافرەکان ڕووبەڕووی یەکتری بوونەوە و زۆریان لە کافرەکان کوشتن و زۆریشیان لێ بە دیل گرتن.

جا دڵخۆشی لەوەدا بوو لەم غەزایەدا بکوژی باوکی خۆی بە دەستی خۆی کوشت و بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە بۆ مەدینە، لەڕێگەشدا بە پەلە دەڕۆیشتن، بۆیە لەم شەڕەدا تەنها چل ڕۆژیان پێچوو.

## باسی نەخۆشبوون ووەفاتی پێغەمبەر ﷺ

لە شەوی چوارشەممەی کۆتایی مانگی (صَفَر)، ساڵی یازدەی کۆچی، پێغەمبەر ﷺ لە نیوەی شەودا بە (أَبُو مُوَيْهِبَة)ی (رضي الله عنهُ) فەرموو: (من فەرمانم پێکراوە تکای لیخۆشبوون بۆ مردووەکانی گۆڕستانی (الْبَقِيع) بکەم، تۆ لەگەڵم وەرە).

جا کە چوونە ناو گۆڕستانەکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:(آلسَّلامُ عَلَيْكُمْ يا أَهْلَ الْمَقابِرِ...) سەلامتان لێبێ ئەی خەڵکی گۆڕەکان، با دڵتان خۆشبێ بەو مردنەی ئێوە لەناویدان، بە هۆی ئەو ژیانەی خەڵک تێیدایە فیتنە و ئاژاوە وەک پارچەکانی شەوی تاریک ڕووی لە خەڵک کردوە، دواییەکەیان بە شوێن سەرەتاییەکەیاندا دێ، دواییەکان لە سەرەتاییەکان خراپترە.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی (أَبُو مُوَيْهِبَة) من کلیلەکانی گەنجینەکانی دونیا و مانەوەی لە دونیادا دراوەتێ و ئینجا چوونە بەهەشتیش، جا کراومە سەرپشک لە نێوان ئەوەیان و لە نێوان چوونە لای خودا و بەهەشت).

جا (أَبُو مُوَيْهِبَة) (رضي الله عنهُ) گووتی: بە دایکم و باوکمەوە گیان فیدات بم، کلیلەکانی دونیا و مانەوەت لە دونیا و ئینجا بەهەشت هەڵبژێرە.



پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نا وَاللَّهِ من چوونە لای خودا و بەهەشتم هەڵبژارد).

جا پێغەمبەر ﷺ تکای لێخۆشبوونی بۆ مردووەکانی گۆڕستانی (الْبَقِيع) کرد، ئینجا گەڕاوە ماڵەوەی و بۆ سبەینێ نەخۆشی وەفاتکردنی دەستی پێکرد، سەرەتای نەخۆشیەکەی ژانەسەرێکی زۆر بەهێز بوو.

دایکە (عائِشَة) (رضي اللَّهُ عَنهَا) فەرموویەتی: کە پێغەمبەر ﷺ لە (الْبَقِيع) گەڕاوە، سەرم دەئێشا، جا پێشوازیم لێکرد و گووتم: ئای سەرم.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵکو من -وَاللَّهِ- ئای سەرم.

جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (تۆ زەرەر ناکەی ئەگەر پێش من بمری، جا من سەرپەرشتیت بکەم و کفنت بکەم و نوێژت لەسەر بکەم و بتنێژم).

جا پێغەمبەر ﷺ نەخۆشیەکەی هەر بەهێزتر دەبوو و ڕۆژێک لە نۆبەتی دایکە (مَيْمُونَة)ی هاوسەریدا (رَضِي اللّهُ عَنها) لەهۆش چوو.

جا گوتیان: لەوانەیە پێغەمبەر ﷺ نەخۆشی (ذاتُ الْجَنب)= بەرەنگی بێ، بۆیە بێ ئیزنی ئەو دەرمانیان لە دەمی کرد، جا پێغەمبەر ﷺ هاتەوە هۆش و فەرمووی:

کێ وای لێکردم؟

گووتیان: (الْعَبّاس)ی مامت، چونکە مەترسی نەخۆشیی بەرەنگی لێدەکردی، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم نەخۆشیە لە شەیتانەوەیە، خوای گەورە شەیتان بەسەر مندا زاڵ ناکا، هەر کەسێک لەم ماڵەدا بێ'دەبێ ئەو دەرمانەی لە دەمی بکرێ، جگە لە (الْعَبّاس)ی مامم.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەر دەیفەرموو: من سبەینێ لەکوێ دەبم؟

جا بە دوای ژنەکانیدا نارد و مۆڵەتی لێ وەرگرتن تا لە ماڵی دایکە(عائِشَة)دا (رضي اللَّهُ عَنهاَ) بمێنێتەوە و لە نۆبەتکردن بیبوورن. ئەوانیش ڕێگەیاندا، جا ئیمام (عَلِي)و ئیمام (الْعَبّاس) (رضي اللَّهُ عَنهَم) پێغەمبەریان ﷺ بە دەست گرت و ئەویش لە نێوانیاندا ڕۆیشت، تا گەیشتنە ماڵی دایکە(عائِشَة) (رضي اللَّهُ عَنهاَ).

جا دایکە(عائِشَة) (رضي اللَّهُ عَنهاَ) (الْمُعَوَّذات)=﴿قُلْ هُوَاللَّهُ أَحَد﴾و﴿قُلْ أَعوُذُ بِرَبِ الْفَلقِ﴾و﴿ قُلْ أَعوُذُ بِرَبِّ النّاسِ﴾ی دەخوێندن و فوی دەکردە پێغەمبەر ﷺ، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەخۆش دەبوو ئەوهای دەکرد.

جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی (عائِشَة) باوکت و کوڕەکەی بانگ بکە، تاکوو بۆ (أَبُو بَكْر) وەسێتێک بنووسم، نەوەک کەسانێک خۆزگە بکەن و خودا و ئیماندارەکانیش ڕێگە نەدەنە کەسێکی تری جگەلە (أَبُو بَكْر)).

جا لەم حاڵەتەی نەخۆشییدا (فاطِمَة)ی کچی پێغەمبەریش ﷺ هات و پێغەمبەر ﷺ سەلامی لێکرد و لە ڕاستەی خۆی داینیشاند و بە نهێنی قسەیەکی لەگەڵ کرد، (فاطِمَة)ش (رضي اللَّهُ عَنهاَ) گریا، ئینجا قسەیەکی تری بە نهێنی لەگەڵ کرد، ئەمجارە (فاطِمَة) (رضي اللَّهُ عَنهاَ) پێکەنی، جا دایکە (عائِشَة) لێی پرسی چی پێ گووتی؟

(فاطِمَة)ش (رضي اللَّهُ عَنهاَ) فەرمووی: نهێنی پێغەمبەر ﷺ ئاشکرا ناکەم.



ئینجا کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد (فاطِمَة) نهێنیەکەی ئاشکرا کرد و فەرمووی: جاری یەکەم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەموو ساڵێک (جُبْرائِيل) عليه السلام یەک جار دەوری قورئانی پێ دەکردمەوە، بەڵام ئەمساڵ دوو جار دەوری قورئانی پێ کردوومەوە، وا دەزانم کاتی مردنم هاتووە، تۆش ئەی (فاطِمَة) یەکەم کەسی لە بنەماڵەی من بە دوامدا دێی و دەمری). منیش گریام، جا دووبارە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (تۆ ڕازی نابی ببیە گەورەی ئافرەتانی بەهەشت و گەورەی ئافرەتانی ئیمانداران=ئەم ئوممەتە؟)، منیش لە خۆشیان پێکەنیم.

هەروەها ڕۆژی پێنج شەممە کۆمەڵە پیاوێکی لەلا بوون و فەرمووی: (وەرن نووسراوێکتان بۆ بنووسم تا لە دوای ئەم نووسراوە گومڕا نەبن). جا ئیمام (عُمَر) (رضي اللَّهُ عنهُ) فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئێش و ئازار ئەو قسەیە دەکا، قورئان بەسە و پێویست بە هیچی تر ناکا.

هەندێکی تریش فەرموویان: با بۆمان بنووسێ... ئیتر کە بووە کێشەکێش، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەڵسن بڕۆنە دەرەوە.

لە حەدیسێکی تردا هاتووە: کە کۆمەڵەکە بووە کێشەیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناگونجێ لەلای هیچ پێغەمبەرێک کێشەکێش بکرێ. جا گووتیان: ئەوە چیەتی؟ ئایا وەخۆیدا دەڵێ؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: وازم لێبێنن...

جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کافرەکان لە دوورگەی عەرەب دەربکەن، ڕێزیش لە وەفدەکان بنێن وەك من ڕێزم لێ دەنان).



ئینجا هەر لە ڕۆژی پێنج شەممەی هەشتی (رَبِيع الأوَّل) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە حەفت کوندەی ئاو، کە زاربێنیان نەکرابێتەوەو لە حەفت بیر پڕ کرابن، ئاوم بەسەردا بکەن تاکوو خۆم بشۆم و بچمە لای خەڵکی مزگەوت و قسەیان بۆ بکەم، جا لەناو تەشتێکی گەورە دایاننا و ئاویان پێدا کرد، تا فەرمووی: بەسە بەسە. ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی (عائِشَة) تا ئێستاش هەست بە ئازاری خواردنە ژەهرکراوەکەی (خَيْبَر) دەکەم، ئەوە کاتی پچڕانی دەماری دڵمە بەهۆی ئەو ژەهرە). جا پێغەمبەر ﷺ پەڕۆیەکی لە سەری خۆی بەست و چووە سەر مینبەری مزگەوت و دانیشت، پێش هەموو شتێك (حَمْد) و (شُكْر)ی خوای کرد، ئینجا دوعای ڕەحمەتی بۆ شەهیدەکانی (أُحُد) کرد و تکای لێخۆشبوونی بۆ لە خوا کردن... ئینجا فەرمووی: (بەندەیەك خوای گەورە کردوویەتیە سەرپشك: لە نێوان خۆشیی دونیا و لە نێوان نیعمەتی لای خۆی؟ ئەویش نیعمەتی لای خوای هەڵبژاردووە).

جا ئیمام (أَبُوبَكْر) (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) تێگەیشت: پێغەمبەر ﷺ خوودی خۆی مەبەستە، بۆیە دەستی بە گریان کرد و فەرمووی: بە خۆمان و ماڵ و منداڵمان فیدای تۆ بین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەی (أَبُو بَكْر) لە سەرخۆ بە. ئینجا پێغەمبەر ﷺ لە وتارەکەی دا باسی گەورەیی و ڕێزداریی (أَبُو بَكْر) (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) کرد و فەرمووی: (لە هەموو کەسێك خاوەن منەتتر (أَبُو بَكْر)ە: لە هاوڕێیەتی و لە ماڵ بەخشین، ئەگەر هیچ کەسێکم کردبا دۆستی خۆم (أَبُو بَكْر)م دەکردە دۆستی



خۆم، بەڵام دۆستایەتی ئیسلام گەورەترە، هەر دەرگایەکی خەڵکی کە بۆ هاتوچۆی نوێژ لە مزگەوتدا کراونەتەوە، گشتی بگرن، تەنها دەرگای (أَبُو بَكْر) نەبێ. جا ئەمەیان دواین وتاری پێغەمبەر ﷺ بوو، هەروەها لەدوای ئەم ڕۆژەی پێنج شەممە، پێشنوێژیی مەغریبی شەوی جومعەی کرد و هیچی تر نەیتوانی لە مزگەوت پێشنوێژی بکا، هەر وەك لە (صَحِيح البخاري)دا لە (أُمُّ الْفَضْل) گێڕدراوەتەوە، بۆیە فەرمانی دا: ئیمام (أَبُو بَكْر) (رَضِي اللهُ عَنهُ) پێشنوێژی بۆ (صَحابَة)كان (رَضِي اللهُ عَنهُم) بکا.

جا دایکە (عائشة) (رَضِي اللهُ عَنها) فەرمووی: (أَبُو بَكْر) (رَضِي اللهُ عَنهُ) دڵ ناسکە، ئەگەر لە شوێنی تۆ نوێژ بکا، لەبەر گریان دەنگی ناگاتە گوێی خەڵک.

جا پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرمووی:

(ئێوە وەکوو ئافرەتەکانی چیرۆکی یوسف پێغەمبەرن ﷺ -واتە: دڵ و زوبانتان لێک جیایە- دەبێ (أَبُو بَكْر) پێشنوێژی بکا)

جا لە نوێژی عیشای شەوی جومعەوە ئیمام (أَبُو بَكْر) دەستی بە پێشنوێژی کرد، تا پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد.

واتە: لە حەڤدە نوێژاندا ئیمام (أَبُو بَكْر) پێشنوێژی کرد، چونکە پێغەمبەر ﷺ جومعە و شەممە و یەکشەممە نەیتوانی بێتە مزگەوت، لە ڕۆژی دووشەممەش لە چێشتەنگاودا وەفاتی کرد.

جا لەو سێ ڕۆژانەدا ڕۆژێکیان ئیمام (أَبُو بَكْر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) لە مزگەوت نەبوو و لە نوێژی بەیانیدا ئیمام (عُمَر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) پێشنوێژیی کرد، جا کە پێشەوا (عُمَر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) (اللّٰهُ أَكْبَر)ی نوێژ دابەستنی گوت پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە گوێی لێبوو، جا فەرمووی:

(نا، نا، نا، دەبێ (أَبُو بَكْر) پێشنوێژی بکا).

ئەوانیش نوێژەکەیان بڕی و ئیمام (عُمَر)یش (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) لاکەوت و پێشەوا (أَبُو بَكْر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) هات پێشنوێژیەکەی کرد.

ڕۆژێکی تریش پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژی نیوەڕۆ هاتە مزگەوت، ئیمام (أَبُو بَكْر)یش (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) پێشنوێژیی دەکرد، جا ئیمام (أَبُو بَكْر) وازی لە ئیمامەتی هێنا و کشاوە دواوە و پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتویی پێشنوێژیەکەی تەواو کرد، ئیمام (أَبُو بَكْر)یش (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) دەنگی (اللّٰهُ أَكْبَر)ەکانی دەگەیاندە نوێژکەرەکان.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە نوێژێکی بەیانیدا – بە دانیشتوویی- ڕەکعەتێکی بە جەماعەت لە پشت ئیمام (أَبُو بَكْر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) کرد، ئینجا کە سەلامی داوە، پێغەمبەر ﷺ ڕەکعەتەکەی تری بە تەنهایی تەواو کرد، بەڵام ئیمامی (التِّرمِذي) فەرموویەتی: سێ جار پێغەمبەر ﷺ لە نەخۆشی وەفاتیدا نوێژی بە جەماعەت لە پشت پێشەوا (أَبُو بَكْر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) کردووە، جا لە بەیانی ڕۆژی وەفاتیدا -کە دووشەممە بوو- پێغەمبەر ﷺ پەردەی ژوورەکەی لادا و تەماشای (صَحابَة)کانی کرد لە پشت پێشەوا (أَبُو بَكْر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) بۆ نوێژکردن ڕیز بوونە.



(أَبُـو بَكْـر)یش (رَضِـيَ اللّٰهُ عَـنهُ) ویسـتی بکشـێتەوە و وایزانـی پێغەمـبەر ﷺ بـۆ نـوێژکردن دێ، بەڵام پێغەمـبەر ﷺ ئامـاژەی بـۆ کـردن ئێـوە نوێژەکەتـان بـکەن و پەردەکەی داخستەوە و لە کاتی چێشتەنگاودا وەفاتی کرد.

واتە: ئەمەیـان دوایـین چـاوپێکەوتنی پێغەمـبەر ﷺ بـوو لە مزگەوتـدا، جـا کە (صَحابَة)کان چاویان بە پێغەمبەر ﷺ کەوت زۆر دڵیان خۆش بوو و وایان زانی لە نەخۆشـیەکەی چـاک بـووەتەوە، بـۆیە پێشـەوا (أَبُـو بَكْـر) (رَضِـيَ اللّٰهُ عَـنهُ) گەڕاوە ماڵەکەی خـۆی لە (السُّـنْح)، هەروەهـا ژنەکانی پێغەمبەریش هەر یەکەیان گەڕاوە ماڵەکەی خۆی...

ئینجا لە سەرەتای چێشتەنگاودا دیسان نەخۆشیەکەی توند و بەهێزتر بۆوە، بۆیە دایـکە (عـائِشَـة) (رَضِـيَ اللّٰهُ عَنهَـا) سـەری پێغەمـبەر ﷺ هێنـا نـاو کۆشـی خـۆی و لەسەر ڕانی خۆی دانینا، ناوە ناوەش ئازاری گیان دەرچوون دەهاتە سەر پێغەمبەر ﷺ بێ هـۆش دەبـوو، جـا کە دەهـاتەوە هـۆش خـۆی جـامە ئـاوێکی لەلا بـوو دەسـتی خۆی تەڕ دەکرد و بەڕووی خۆیدا دەیهێنا و دەیفەرموو:

(لَاْ إِلٰـهَ إِلَّاْ اللّٰه) بەڕاسـتی مـردن ئـازاری هەیە، و دەیفەرمـوو: خـودایە یـارمەتیم بـدە لەسەر ئازارەکانی مردن.

جـا (فـاطِمَـة)ش (رَضِـيَ اللّٰهُ عَنهَـا) دەیفەرمـوو: هەی هـاوار لەو ناخۆشـیەی بـاوکم. پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: لەمڕۆ بەولاوە باوکت هیچ ناخۆشی تر نابینێ.

لەو حاڵەتەدا پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (لەعنەتی خوا لە جولەکە و دیانەکان بدا، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردۆتە مزگەوت).

ئینجا فەرمووی: (ئاگاتان لە نوێژ و لە کۆیلەکانتان بێ).

ئینجا هەر دووبارەی دەکردەوە و تا دەنگ لە سینگییەوە هات.

لەو کاتەدا (عَبْد الرَّحْمن) کوڕی پێشەوا (أَبُو بَكْر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) هاتە ژوورەوە و سیواکێکی لە دەستدا بوو پێغەمبەر ﷺ تەماشای سیواکەکەی کرد.

دایکە (عائِشَة) (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) فەرمووی: بۆت بگرم؟

پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی کرد: بەڵێ، بۆم وەربگرە.

دایکە (عائِشَة) (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) سیواکەکەی وەرگرت و سەری پێغەمبەری ﷺ بڵند کرد و دایە پاڵ سینگی خۆی و سیواکەکەی دایە دەست، جا کە پێغەمبەر ﷺ سیواکەکەی خستە ناو دەمی پیرۆزی، هەستی کرد سیواکەکە ڕەقە، بۆیە دایکە (عائِشَة) (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) فەرمووی: سیواکەکەت بۆ نەرم بکەم؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

دایکە (عائِشَة) (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) سیواکەکەی بە ددانەکانی جوی و نەرمی کرد و دایەوە دەستی.

پێغەمبەر ﷺ بەخۆی سیواکی پێدەکرد، جار جارەش دەستی لە ناو جامە ئاوەکە دادەنا و (لَاْ إِلٰـهَ إِلَّاْ اللّٰه)ی دەگوت، ئینجا سێ جار فەرمووی: (فِي الرَّفِيقِ الأعلى) لەگەڵ هاوڕێی شوێنی بەرزتردا دەبم. واتە: پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان.



جا ڕستەی (الرَّفِيقِ الأعلى) دوایین فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بوو، لە دوای ئەم فەرموودەیە لە نێوان سینگ و چەناگەی دایکە (عائِشَة) (رَضِي اللهُ عَنهَا) گیانی موبارەکی دەرچوو و سیواکەکەی لە دەستی بەربووەوە و دەستی کەوتە ناو جامە ئاوەکە.

دایکە (عائِشَة) (رَضِي اللهُ عَنهَا) فەرموویەتی: یەکێک لە نیعمەتەکانی خوا بۆ من ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ لەماڵی مندا وەفاتی کرد، لە نێوان چەناگە و سینگی مندا گیانی دەرچوو، خوای گەورە لە کاتی وەفاتیدا تفی من و تفی ئەوی بە یەکەوە کۆکردەوە. واتە: لەوکاتەی سیواکەکەی بە ددانەکانی خۆی بۆ نەرم کرد.

دایکە (عائِشَة) (رَضِي اللهُ عَنهَا) فەرموویەتی: کە پێغەمبەر ﷺ گیانی دەرچوو، بۆنێکی زۆر خۆشی لێهات، بۆنی ئەوها خۆشم نەبینیوە، بەڵام نەزانینی من ئەوەبوو کە پێغەمبەر ﷺ گیانی دەرچوو سەری ئەوم دانا لەسەر بالیفێک و لەگەڵ ژنەکان دەستم بە گریان کرد، (فاطِمَة)ش (رَضِي اللهُ عَنهَا) دەستی بە گریان کرد و فەرمووی: (يا أَبَتاه أَجابَ رَبّاَ دَعاه، يا أَبَتاه مَنْ جَنَّةُ الْفِرْدَوْسِ مَأْواه، يا أَبَتاه إِلَى جِبْرِيلَ نَنْعاه). هۆ باوکە وەڵامی خودایەکی داوەتەوە کە دەعوەتی کردووە، هۆ ئەو باوکەی بەهەشتی (الْفِرْدَوْسِ) شوێنیەتی، هۆ باوکە هەواڵی وەفاتت بۆ لای (جِبْرِيلَ) دەبەین.

ئینجا کە پێغەمبەریان ﷺ بەخاک سپارد، (فاطِمَة) (رَضِي اللهُ عَنهَا) فەرمووی: ئەی (أَنَس) چۆن دڵتان هات گڵ بەسەر پێغەمبەردا ﷺ بکەنەوە؟..

حەزرەتی (ابن عباس) (رضي الله عنه) فەرموویەتی:

(پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی دووشەممەدا لەدایک بووە، لە دووشەممەدا بووەتە پێغەمبەر، لە دووشەممەدا کۆچی کردووە بۆ مەدینە، لە دووشەممەدا چووەتە ناو شاری مەدینە، لە دووشەممەدا وەفاتی کردووە).

واتە: لە چێشتەنگاوێکی درەنگی نزیک نیوەڕۆ ڕۆژی دووشەممەی (١٢) دوانزەی (ربیع الأول)ی ساڵی یانزەی (١١)کۆچی، بەرامبەر هەشتی (٨) (حزیران)ی ساڵی (٦٣٣)ی زایینی پێغەمبەر وەفاتی کرد، ماوەی سێزدە (١٣) ڕۆژان لە نەخۆشی وەفاتیدا مایەوە.

کە پێغەمبەر وەفاتی کرد تەمەنی شەست و سێ (٦٣) ساڵ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر و ڕیشیدا بیست مووی سپی نەبوو.

ماوەی پێغەمبەرایەتی بیست و سێ (٢٣) ساڵ بوو، سێزدە (١٣) ساڵ لە مەککە، دە (١٠)ساڵیش لە مەدینە.



## دابەزینی خەمەکان بەسەرهاوەڵاندا

کاتێـک کە (صَـحابَة)کان (رَضِـي اللّٰهُ عَـنهم) هەواڵی وەفـاتی پێغەمبەریـان ﷺ پـێ گەیشت، سەریان لێشێوا و هۆشیان تێکچوو، پێشەوا (عَلي) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) لە پێ کەوت و نەیتوانی هەڵسێتە پێوە، پێشەوا (عُثمان) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) لاڵ بوو قسەی پـێ نەدەکـرا، پێشـەوا (عُمـر)ش (رَضِـي اللّٰهُ عَـنهُ) شـێوا و هۆشـی تێکچـوو، لە مزگەوتدا وتاری دەدا و دەیگوت: (پێغەمبەر ﷺ نەمردووە، پێغەمبەر ﷺ نامرێ تا (مُنافِق)ەکـان لە نـاو دەبـا، پێغەمـبەر ﷺ وەکـو (مُوسَـى) ﷺ چـووەتە لای خـوا و دەگەڕێـتەوە، هەر کەسـێک بڵـێ: پێغەمـبەر ﷺ مـردووە، دەیکـوژم،.... ئیتـر هەر ئەوها هەڕەشەی دەکرد تا ڕۆخەکانی دەمی کەفیان کردبوو.

بەڵام پێشـەوا (أبُـوبَکر) (رَضِـي اللّٰهُ عَـنهُ) هـیچ نەشـێوا بـوو، بەڵکو لە ماڵی خـۆی لە (السُّـنح) بە سـواری ئەسـپەکەی هـات دابەزی و فرمێسـکی لە چاوەکـان دەهـاتنە خـوارەوە و یەکسـەر ڕووی کـردە لاشـە پیرۆزەکەی پێغەمبەر ﷺ دیتی بە بەرماڵێـک داپۆشـــراوە، جـــا بەرمـــاڵەکەی لەســـەر ڕووی پێغەمـــبەر ﷺ لادا و دەســـتی بە ماچکردنی پێغەمبەر ﷺ کرد و دەشگریا و دەیفەرموو:

بە دایـک و بـاوکمەوە فیـدات بـم ئەی پێغەمـبەری خـوا بە زینـدوویی و بە مردوویـی پـاک و بـۆن خۆشـی، واللّٰه خـوای گەورە دوو مردنـت لەسـەر کۆتاکـاتەوە، ئەو مردنەش کە خوای گەورە لەسەری نوسیبووی، ئەوە مردی.

ئینجا هاتە دەرەوە و فەرمووی هۆ (عُمَر) دانیشە، بەڵام پێشەوا (عُمَر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) دانەنیشت و هەر هەڕەشەی دەکرد.

پێشەوا (أَبُوبَكرْ) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) دەستی بە وتار کرد، خەڵکەکەش وازیان لە ئیمام (عُمَر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) هێنا و ڕوویان کردە لای پێشەوا (أَبُوبَكرْ) (رضِي اللّٰهُ عَنهُ).

پێشەوا (أَبُوبَكرْ) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) فەرمووی:

خەڵکینە هەر کەسێک لە ئێوە (مُحَمَّد)ی ﷺ دەپەرست، ئەوە بێگومان (مُحَمَّد) ﷺ مرد، هەر کەسێکیش لە ئێوە خودای گەورەی دەپەرست ئەوە خوای گەورە زیندوە و نامرێ، خوای گەورە دەفەرمووێ: (وَمَا مُحَمّد إلاّ رَسُولُ قَدْخَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ ألرُّسُلُ أَفَإِنْ ماَتَ أَوْ قُتِلَ أنْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقبَيْه فَلَنْ يَضُرَّ أَللّهَ شَيْئاً وَسَجْزِى أللّهُ الشَّاكِرِينَ) [آل عمران: ١٤٤]. (مُحَمَّد) ﷺ هەر پێغەمبەرێکە، پێش ئەویش چەندەها پێغەمبەری تر نەماون، یان مردوون، یان کوژراون، چونکە هەر هەموویان ئادەمیزادن، جا ئەگەر (مُحَمَّد)ش ﷺ بمرێ، یان بە دەستی کافرەکان بکوژرێ، ئایە ئێوە لە ئاینی ئیسلام پاشکەست دەبنەوە؟

هەر کەسێک لە ئایینی خۆی پاشکەست ببێتەوە، ئەوە هیچ زیانێک لە خودا نادا، بێگومان خودا پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە، کە لەسەر ئاینی خۆیان دەمێننەوە.



پێشەوا (عُمَر) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) فەرمووی: وەک بڵێی پێش ئێستا ئەو ئایەتەم هەر نەبیستبێ، ئەوجا زانیم پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە، بۆیە لە پێوە کەوتمە سەر زەوی و خۆم پێ ڕانەگیرا.

موسڵمانەکانیش ئەم ئایەتەیان لە ئیمام (أَبُوبَكرْ) (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) وەرگرتەوە و بەردەوام دەیان خوێندەوە.

## شۆردن و كفن كردن و ناشتنی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ

**شۆردنی پێغەمبەر ﷺ:-**

ئینجا لە دوای نیوەڕۆی ڕۆژی دووشەممە موسوڵمانان سەرقاڵی (بَيْعَة)ی ئیمام (أَبُو بَكْر ) (رضي الله عنهُ) بوون و ئەویان كردە (خَلِفَة)=جێنشینی پێغەمبەر ﷺ، لە ڕۆژی سێشەممەش (بَيْعَة)ی گشتی وەرگیرا، ئینجا دەستیان بە كاروباری تەرمی پێغەمبەر ﷺ كرد، بەڵام بۆ شوشتنی پێغەمبەر ﷺ گوتیان:

نازانین وەكو مردووەكانی خۆمان ڕووتی بكەینەوە، یان لە بەرگی خۆیدا بیشۆین؟

جا لەو كات بۆرژانێكیان بە سەردا هات و یەكێكی نەناسراو لە گۆشەی ژوورەكە پێی گوتن: لە بەرگی خۆیدا پێغەمبەر ﷺ بشۆن.

ئەوانیش دەستیان بە شوشتنی پێغەمبەر ﷺ كرد و كراسەكەشی هەر لەبەردا بوو و ئاویان پێدا دەكرد و بە كراسەكەش هەڵیاندەگووشی.

ئەوانەی بەشداری شوشتنیان كرد:

پێشەوا (عَلِي)و (الْعَبّاس)و هەردوو كوڕەكانی ئیمام (الْعَبّاس)ش: (الفَضل) و (قُثَمْ)، و (أُسامَة بن زَيْد)و (صالِح)ی ئازادكراوی پێغەمبەر ﷺ.

لەكاتی شوشتنیشی (كولە)= پەردەكانیان دانابوو، لە بیری (أرِيس)ش ئاوی شۆردنیان بۆ هێنا.



**_کفن کردنی پێغەمبەر ﷺ:-**

ئینجا لە دوای شوشتن کراسەکەیان لێداکەنانـد و لە سێ پارچە کفنی سپیدا کە لە لۆکە دروست کرابوون کفنیان کرد، کراس و مێزەر لەگەڵ ئەو سێ پارچە کفنەدا نەبوون.

**نوێژکردن لەسەرپێغەمبەر ﷺ:-**

ئینجا لە دوای کفن کردن پێغەمبەریان ﷺ لەسەر تەختێک دانا و (صَحابَة)کان (رضي اللّهُ عنهُم) کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتن بە تەنیایی بێ ئیمام نوێژی جەنازەیان لەسەر دەکرد، هۆیەکەشی ئەوە بوو خوای گەورە دەفەرموێ: خودا و (مَلائِكَة) سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ لێدەدەن.

فەرمانی کردووە ئیماندارەکانیش سەڵاواتی لەسەر لێبدەن، بۆیە هەرکەسەو پێویستە ڕاستەوخۆ سەڵاواتی لەسەر لێبدا نوێژ لەسەرکردنیشی هەر ئەوهایە، ئەگەرنا ئەو کات پێشەوا (أَبُو بَكْر) (رضي اللّهُ عنهُ) کرابووە (خَلِفَة)و مافی پێشنوێژیی جەنازەشی هەبوو.

هەندێ زانای تریش فەرموویانە هۆیەکەی ئەوە بوو تاکو نوێژ لەسەر کردنەکەی زۆر جار دووبارە ببێتەوە. وَاللَّه اعلم.

**-ناشتنی پێغەمبەر ﷺ:-**

لەبارەی ناشتنی پێغەمبەری خۆشەویستمانەوە ﷺ ڕای جیاواز هەبوون، هەندێک گوتیان لە (ألْبَقِيع)، هەندێک گوتیان لە لای پێغەمبەر (إبراهِيم). هەندێک گوتیان لە لای مینبەرەکەی، هەندێک گوتیان لە شوێنی نوێژکردنی.

پێشەوا (أبُو بَكْر) (رضي اللهُ عنهُ) هات و فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو فەرمووی: (هەر پێغەمبەرێک وەفات بکا لە شوێنی وەفاتکردنیدا دەنێژرێ).

جا بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە یاتاغەکەی پێغەمبەریان ﷺ لادا و لە ژێر یاتاغەکە لەژوورەکەی حەزرەتی (عائِشَة)دا (رضي اللهُ عنها) گۆڕەکەیان بۆ هەڵکەند.

جا لەبارەی چۆنیەتی گۆڕەکەش، دوو ڕای جیاواز هەبوون:

ئایا (لَحْد)=لادڕ بێ، یان (شِقّ)=ناودڕ بێ، (أَبُو طَلْحَة) (رضي اللهُ عنهُ) وەستای گۆڕی لادڕ بوو، (أَبُو عُبَيْدَة)ش (رضي اللهُ عنهُ) وەستای گۆڕی ناودڕ بوو.

پێشەوا (عُمَر) (رضي اللهُ عنهُ) فەرمووی: بە دوای هەردووکیاندا بنێرن، کامەیان پێشتر هات با ئەو گۆڕەکە هەڵبکەنێ.

ئینجا فەرمووی: خودایە بۆ پێغەمبەری خۆت ﷺ چاکترەکە هەڵبژێرە.

(أَبُو طَلْحَة) (رضي اللهُ عنهُ) لەپێشدا هات و گۆڕێکی لادڕی هەڵکەند، پێشەوا (عَلِي) و (الْعَبّاس) و (الفَضْل)ی کوڕی (رضي اللهُ عنهم) دابەزینە ناو گۆڕەکە و (شَقْران)ش (رضي اللهُ عنهُ) پارچە پۆشاکێکی لەناو گۆڕەکە ڕاخست.



بـزانە: ڕاخسـتنی ئەم پـارچە پۆشـاكە تـایبەتە بە پێغەمـبەر ﷺ، چـونكە لاشـەی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام لە ناو گۆڕدا ناڕزێ.

ئینجـا لە شـەوی چوارشـەممەی چـواردەی (ربیـع الأول) پێغەمـبەر ﷺ لە لای پێیەكانیەوە دانرا ناو گۆڕەكەی و گڵی بەسەردا كرا.

ئینجا كە لە كاتی گڵ بە سەرداكردنەوەدا دەنگی بێڵەكان هات، ژنەكانی پێغەمبەر ﷺ دەستیان بە گریان كردەوە و خەڵكی ناو مزگەوتیش دەستیان بە گریان كرد، دانیشتوانی مەدینەش یەكدەنگ هاواریان لێهەڵسا و شاری مەدینە بە گریانی ئەوان لەرزیەوە. لەو كاتەدا (بلال) (رضي الله عنه) بانگی بەیانی دا، ئەویش گریا و زیاتر خەڵكەكە غەمبار بوو.

گۆڕەكەی پێغەمبەر ﷺ لە ناو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە، پێشەوا (أبُو بَكر)و (عمر)یش (رضي الله عنهم) لە ژوورەكەی گۆڕی پێغەمبەردا ﷺ نێژراون.